# ڕۆڤار

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
ژمارەی ٥٩



# وەفایی

## پێرست



**ژمارەکانی داهاتوومان تایبەتە بە هەریەک لە:**

گۆران (شاعیر)
پیربال مەحموود ( شاعیر )
عەبدوڵلا جەوهەر (نووسەر)
بەدیع باباجان ( هونەرمەند )
شوکر مستەفا (نووسەر ، وەرگێڕ)

سەرپەرشتیاری گشتی: دلشاد عەبدوڵلا
ستافی ڕۆڤار: یاسین عومەر / سەباح ڕەنجدەر
هەڵەچن: نەورۆز حاجی سەید گوڵ
دەرهێنەری هونەری: حەمید ئازموودە
هێلکاریی: محەمەدعارف / قەڵەمکێشی وەفایی: قەرەنی جەمیل
ڕۆڤار: بلاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە/ هەر ژمارە تایبەتە بە داهێنەرێک
دەزگای ئاراس و سەردەم وەکوو پرۆژەی هاوبەش دوومانگ جارێک دەری ئەکەن
ناونیشان: هەولێر -شەقامی گولان-دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس
سلێمانی -شەقامی سالم -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ژمارەی تەلەفۆن سەرپەرشتیاری گشتی :
کۆرەک: ٠٧٥٠٤٥١٢٧٨٦ ئاسیا: ٠٧٧٠١٥٣٢١٤٥
Email:d.abdullah@araspress.com



١ – مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە کتێبەکەی "مێژووی ئەدەبی کوردی"دا کوتوویە لە سالی ١٨٣٨ز لەدایک بووەو لە ١٨٩٩زدا کۆچی دوایی کردوە.

هەر هاوڕێیانی دەگێڕنەوە کە وەفایی زۆر شوێنی کوردستان گەڕاوە لە زۆر شوێنیش ماوە ماوە ئاکنجی بووە، وەک شارەکانی سلێمانی و مهاباد و هەکاری، بەڵام نەیتوانیوە زۆر لە شوێنێک ئۆقرە بگری و بمێنێتەوە.

دەبێت ئەوەش بزانین کەوا کورد زۆر قەرداری شاعیرانی کلاسیکن و ڕاستی ئەم وتەیەش لای هەر یەک لە ڕۆژهەڵاتناسانی وەک ئەلیکسەندەر ژاپا و مینۆرسکی دووپات دەبێتەوە کە ژاپا گوتویە: کورد قەرداری مەلا مەحموودی بایەزیدین بەوەی بەشێکی زۆری عادات و تەقالید و کلتوور و زانیاریەکانی ئەو کاتانەی سەردەمی ژیانی خۆی تۆمار کردووەو ئێستا لە کتێبخانەی سالیکۆف شیدرن لە سان پۆترۆس بۆرک پارێزراوە.

هەروەها مینۆرسکی گوتوویە: هەر کەسێک دیوانی مەلای جزیری نەخوێنێتەوە ئەوە بە ڕاستی لە نرخی ئەدەبیاتی کوردی و بەرزیی زمانی کوردی تێ ناگات.

لەملاشەوە ڕەنگە ئەمانە تەنیا ئیعجاب بن، بەو پێیەی هەر یەک لەو دوو ڕۆژهەڵاتناسە هەریەکەیان نزیکبونەوەی زیاتریان لەو دوو شاعیرەی کورد هەبووەو ڕەنگە بە هۆی ئەوەی کە ماوە بواری ئەدابن نەیانتوانیبێت لە شاعیرانی دیکەی کورد بکۆڵنەوە، یان هاوسەردەمی شاعیرانی وەک وەفایی نەبوون و دەزانین کە ئەلیکسەندەر ژاپا لە دەیەی پەنجاکانی سەدەی نۆزدەدا پەیوەندی لەگەڵ مەلا مەحموودی بایەزیدی هەبوە و وەفاییش لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستدا فەوت بووە.

بۆ زیاتر وردبوونەوە لە وردەکارییە پڕ لە سەلیقەکانی وەفایی چەند نموونەیەک لەم نووسینەدا دێنینەوە.

بۆ نموونە لە وردەکاریەکانی کێشی عەروز[2] لای وەفایی: ئاشکرایە کە شاعیرانی پێشومان کە بە پێڕەوکەرانی ڕێبازی کلاسیزم ناوزەدیان ئەکەین زۆرێک ماندوو ئەبوون بە دەست دانانی شیعرەوە بە تایبەت لە سەرەتاکانی شیعر نوسینیاندا، ئەڵبەتە مومارەسەو پاشتر قووڵبوونەوە لە نوسیندا کات دوای کات زیاتر خێراتری کردوون و کۆنترۆڵی کێشەکانیان کردوە.

ئەوەی جێی سەرنجە کێش لە شیعری کوردیدا . ئەگەر لە باباتاهیری هەمەدانیشەوە بۆی بڕوانین دەبینین، عەروز پێڕەو کراوە. ئەم عەروزەش کە بوو بە عیلمێک و فەقێکانی کوردستان و ناوچەکانی ڕۆژهەڵات کاتێ دەبوونە موستەفید دەبوو بیخوێنن و یەکێک بوو لە ١٢ عیلمەکەی کە ئیجازەی مەلایەتیی پێ وەردەگیراو تا ئەمڕۆش لە هەندێ ناوچەی کوردستان ئەم نەریتە هەر باوە. ئەم زانستە لە ڕێی خەلیلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی فەراهیدیەوە هاتە ناو شیعری عەرەبیەوەو لەوێوە بۆ شیعری ئەتەوەکانی ڕۆژهەڵات.

بەڵام خەلیل چۆنی ئەم عیلمە تیۆرە کرد! ئەم دوا دواییانەدا دەرکەوتوە کە ئەم عیلمەی دەقاو دەق لە عەروزی تایبەتی "قیدا"وە وەرگرتوەو پاشان تەعریبی هەموو عیلمەکەی بە زاراوەکانیشیەوە کردوە.

هەرچۆن بێت ئەوا ئێستا دەبینین کە هەموو ئەدەبیاتی کلاسیزممان بەم پێڕەوە نووسراون. چونکە ئەنگی بووە کەسێک بڵێت شیعر ئەنووسم و نەزانێت کامە بەحری عەرەبی بەکار هێناوە لە شیعرەکەیداو تەنانەت ئەنگی بووە ئەگەر مەرجە بچووک و شاراوەو کەم دیارەکانی ناو بەحرەکەش پێڕەو نەکات. وەک ئەوەی کە بەیتێک بەوەدا دەناسرێتەوە دێڕی یەکەمی قەسیدەیە بەوەی کە دەستکاری کێشی سەدرەکەی دەکرێ، بەڵام بەو مەرجەی زانستی عەروز ڕێی پێ داوە.

بەحرەکانی کێشی عەروزی عەرەبی کە فەراهیدی دیاری کردن. ئەو کات بە گوێرەی ئەو شیعرە عەرەبیانەی کە لە بەر دەستا بوون و ناسراو بوون، شازدە بەحری لێ دیاری کرد. بەڵام کە ئەم عیلمە گەیشتە ناو نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات (وەک کورد و فارس)، وەک ئەوەی دیاری کراوە بوون بە بیست و یەک بەحر، ئەویش بە پێی ئەو ڕێنماییانەی کە زانستەکە ڕێی پێ دەدات، ئەمەیان کردوە.

وەلێ لێکۆڵینەوەکانی عەروزناسانی شیعری کوردی ڕەنگە، زۆرێک دەقی شیعریی شاعیرانیان هێشتا هەڵگێشە نەکردبێ بە کێشی عەروزی عەرەبی. بۆیەکا ڕێی تێ دەچێت ئەو ژمارەی بەحرانە گۆڕانی تێ بکەوێ.

بۆ نموونە شاعیر "ئەحمەد هەردی" کە عەروززانێکی زۆر بە توانا بووە، وەک خۆی فەرموویە، زۆر هەوڵی داوە وردەکاریەکانی ئەم عیلمە ڕەچاو بکاتو پەیامیش بداتە ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێ لەسەر ئەم مەسەلەیە قسە بکەن کەوا پێویستە ئاگایان لە خۆیان بێت لە بڕیاردان لەسەر کێشی شیعرێک. چونکە بۆ نموونە چۆنی "زیحاف" بۆ سەر هەر کێشێک، بە زۆری دەبێتە دروستبوونی کێشی نوێ[4].

ئەوەی لێرەدا مەبەستە بخرێتە ڕوو، ئەوەیە نموونەیەک لە شیعرەکانی وەفایی وەر بگرین. تاوەکو بزانین وەفاییش وەک شاعیرێکی سەر بە ڕێبازی کلاسیزم چی کردوەو چۆن کێشە عەرووزیەکانی بەکار هێناوەو چی پێشکەش کردوین:

دەگەڕێینەوە بۆ دیوانەکەی وەفایی[5] و نموونەیەک وەردەگرین:

---

٢ – زانستی عەرووز یەکێکە لە دوازدە زانستەکەی کە دەبوو فەقێ لە سەردەمانی خوێندنیدا وەری بگرێ ئەوجا دەبوە مەلای دوازدە عیلم.

٣ – پلەیەکی فەقێیەتیە: پلەیەکی خوێندنی مەلاییە.

٤ – بڕوانە: عەروز لە شیعری کوردیدا، نوسینی: ئەحمەد هەردی، وەرگێڕانی: ئاسۆس هەردی، چاپی یەکەم، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. لا ١٩.

٥ – دیوانی وەفایی: لێکۆڵینەوەی: محەمەد عەلی قەرەداخی، چاپی دوەم ١٣٨٧. سنە. پەخشانگای ئانا.

(٦)

*گەردشی چاوت قەراری عاشقی میسکین دەبا*
*ساحیری چاو بەستە ئاری دڵ دەکێشێ دین دەبا*

موفتەعیلون فاعیلاتو موفتەعیلون فاعیلا
موفتەعیلون فاعیلاتو موفتەعیلون فاعیلا

ئەم بەحرە ناوی "مونسەریحی مەتویی مەحزوف"ە.
دیارە بەکارهێنانی بەحرێکی ئاوا لای شاعیرێکی کورد زۆر وردەکاری دەوێ و شارەزاییەکی کەم وێنەی دەوێ لە زانستی عەروزدا. کە بێگومان زۆر وەستایانە وەفایی پێی هەستاوەو هیچ لەنگییەکی تێدا بەدی ناکرێ و دەبینین وەک مەلەوانێکی زۆر شارەزا لە بەحرەکانی ئەم زانستەدا مەلەوانێتی کردوەو ڕەنگە بۆ ئەو بۆچوونەش بچین کەوا ویستبێتی کارگەلێک بکات کەوا شاعیرانی پێش خۆی زۆر بە کەمی خۆیان لێ دابێت.
ئەگەر ئەمە بابەتێکی نیشکردن بێت لە ڕوخسار و قاڵبی شیعردا. ئەوا خۆ لە ناوەڕۆکیشدا وەفایی هیچ کەمتری نەکردوە، بۆ نموونە با دوو دێڕ شیعری دیکەی وەفایی وەر بگرین و لە ناوەڕۆکیان بکۆڵینەوە، با لێرەدا سەرنج لە دوو دێڕە شیعری وەفایی بدەین، کە هەر یەکەیان بۆ خۆی دەکرێت جێی لێکۆڵینەوەی زۆر بەپێز بن‌و بابەتی ئەک وتار بەڵکو توێژینەوەش بن، لەم لایەنەوە دوو نموونە لەم بابەتە سەرنجڕاکێشانە. لای وەفایی لە دوو شیعری جیاوازی دیوانەکەیدا. بە نموونە دێنینەوە:
یەکەم/ شاعیرانی پێشوومان زۆر حەکیم بوون لە مامەڵە لەگەڵ ناوەڕۆکی بابەت و وشەو ئەدەبدا ئەمەش ڕەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کەوا هەموو شاعیرانی کلاسیزممان مەلا یان کۆلکە مەلا بوون یان هیچ نەبێت زانستی عەرووزیان لە فەقێیەتی وەرگرتوە، بۆیە ئەو وردەکاری‌و زانیاریی‌و لێهاتوویییەی لەواندا بەدی دەکرێ، جارێکی دیکە ڕەنگە لە شاعیرانی نوێ‌و هاوچەرخدا بەدی نەکرێتەوە، ئەوەتا شاعیرانی ئەمڕۆ بە کۆمەڵێک زانیاریی جوداوە دەچنە بواری ئەدەبەوە، بەڵام ئەوانی پێشومان دەبوو ڕێساو یاسای وردو پڕ بەها فێر ببن تا لە تاکە بەیتێکدا جێبەجێی بکەن‌و شیعری پێ بنوسن، چ جای غەزەل‌و قەسیدە کە هەر یەکەیان قاڵبی خۆی هەیەو لادان لە پچوکترین ڕێسا واتا شکاندنی قاڵبەکەو دەرکەوتنی ناشاعیریتی نووسەرەکەی.
خەمی شاعیرانی پێشوومان زۆر گەورە بووەو لە نمونەی ئەم خەمەشدا لە شیعرێکی ئەحمەدی خانیدا دەبینین ئاواتەخوازی ئەوەیە کە کوردانیش[٧] "خودانێکی عالی کەرەم‌و لەتیفیان ببێ. ئەمانەش لە پێناوی ئەوەدا کەوا خانی بتوانێ شیعرو خاتیرەکانی خۆی بە جیهاندا بڵاو بکاتەوەو بەرز ڕایان بگرێ‌و بەم هۆیانەوە بتوانێ ئاوڕێک لە ڕابردوو بداتەوە تا ئایندەیەکی جوانتر و گەشتر بناغە بکات بۆ داهاتووی ئەدەبیات.
لەم جۆرە خەمانە زۆر هەبوون و لای زۆرینەی شاعیرانی کلاسیکمان بەردەوام ڕەنگی داوەتەوە تا دوایەمین قوتابخانەی کلاسیزمی کوردیمان کە قوتابخانەی شیعریی بابانە، هەر هەمیشە دوبارە بۆتەوە، دەشزانین قوتابخانەی شیعریی بابان تەنیا بە سنوری زاری کرمانجی خوارودوە[٨] نەوەستا، بەڵکو بەرەو ناوچەکانی دیکەش پەلی هاویشت‌و کاریگەری لەسەر زاری گۆران (هەورامی، زەنگنە، شەبەکی، زازایی، باجەلانی، ڕۆژبەیانی)و لوری (ناوچەکانی باشوری کامیاران‌و خانەقی‌و قەسری شیرین) دانا.
وەفاییش یەکێکە لەو شاعیرانەی کە لە دەرەوەی سنوری ئەدەبیاتی قوتابخانەی شیعریی بابانەو کاریگەریی ئەم قوتابخانەیەی کەوتۆتە سەرو لە ڕاستیدا ئەو لەدایکبووی شاری مهابادی ناوەندی بەشە زاری موکریان بوودو کە ئەمیش کاریگەریی ئەوانی بە سەردوە بوودو هەمان ڕێچکەی ئەوانی گرتوە لە بەرهەمهێنانی شیعرو ئەدەبیاتدا. وەک باسمان کرد وەفایی زۆر گەشتی کردوەو ڕەنگە زۆر جاریش سەردانی سلێمانیی کردبێ‌و لەگەڵ ڕۆشنفیکرانی ئەو سەردەمەی سلێمانیدا هەڵسوکەوتی کردبێ‌و ڕەنگە زۆرجاریش کەوتبێتە کۆڕی ئەدەبی‌و شەڕە شیعریشەوە کە لە سەردەمی ژیانی ئەودا لە سلێمانی باو بووە.
نمونەی یەکەم:

*زەڕەیەکی لە سیپەری دەمی تۆ مردو نەزانی*
*حەیرانی کەماڵاتی فلاتوون‌و ئەرەستووم.*[١٠]

تێگەیشتن لە داهێنان‌و زانیایی‌و حەکیمی شاعیرانی کلاسیکمان زۆری دەوێ، چ جای سەردەم. لەو نمونەیەی پێشودا وردەکاری لە زمان‌و حیکمەتی فەیلەسوفاندا کراوە، کە دەکرێ ئەمە ڕێخۆشکەریش بێت بۆ زۆر بابەتی هزری‌و ناوەزیی لای شاعیرێکی وەک وەفایی کە بێگومان شارەزایی هەبوە لە کەمالییەکانی[١٠] هەر یەک لە ئەرەستوو پلاتۆ، ڕەنگە زانیبێتی ئەوان کێن‌و چۆن کاریان لە فەلسەفەدا کردوە، دەنا خۆی ئەندەدا لەم بابەتە هەستیارە کە زۆر جێی لێکۆڵینەوەیەو ناکرێ پشتگوێ خرێن‌و زانیویە چ وردەکارییەکیان هەیە لە حیکمەتەکانی سر هەڵمالین‌و نهێنی دۆزینەوەی زانستەکانداو شایانی ئەوەن کە حەیران‌و سورماو لەو دوو زانایە بڕوانین.
ئەم پرسە فەلسەفیەی وەفایی وروژاندوویەتی،

٦ – دەقی یەکەمی هەمان سەرچاوە، لا ٧١
٧ – واتا خاوەن، کە مەبەست لێی سەرکردەو گەورەیە.
٨ – بەڕێز د. فوئاد حەمە خورشید لە کتێبی زارەکانی زمانی کوردی‌و دابەشبوونی جوگرافییاندا زاری کرماجی خواروو، بە کرمانجی ناوەڕاست ناو دەبات (کە لە شێوە کشتییەکەیشدا بە زاری سۆرانی لە ناو خەڵکدا ناسراوە کە خۆی زاری سۆرانی تەنیا بەشە زارێکە لەم زارە، وەک چۆن بە هەڵە لە کوردستانی باشوردا بە زاری کرمانجی ژووروو دەڵێن بادینانی لە کاتێکدا بادینانی بەشە زارێکە لە زاری کرمانجی ژووروو)و دەیکات بەم بەشە زارانەوە: شێوەزاری سلێمانی، شێوەزاری موکریانی، شێوەزاری گەرمیانی، شێوەزاری ئەردەلانی، شێوەزاری سۆرانی.
٩ – دیوانی وەفایی، چاپی دووەم ١٩٨٤، ل ٧٢
١٠ – کامڵیی‌و تەواوی.

کەلێک پێش ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆمان کەوتوەو دەبینین لە دەیەی شەستەکانی سەدەی بیستەوە، ئەوجا وردە وردە پرسە فەلسەفییەکانی ئەرەستوو پلاتۆ کەوتونەتە ژێر لێکۆڵینەوەو ڕۆشنفیکرانەوەو دواتر ماموستا کوردەکانی بەشی فەلسەفەی زانکۆکانی ئیراق، ئیدی وردە وردە ئەم بابەتەیان وروژاندو ناساندیانن بە خوێنەرانی کورد. واتا دەیان ساڵ (نیو سەدە زیاتر) دوای وەفاتی وەفایی ئەوجا ناوی ئەو دوو فەیلەسوفە هاتنە ناو کتێبی کوردیەوە.
کەر بە جوانی لە دێرە شیعرەکە بکۆڵرێتەوەو ڕسانەرانانەش بۆی بڕوانرێ‌و تەماشای ئاستی واتاسازیی شیعرەکە بکرێت، هەست بەو وردەکارییانە دەکرێ کە وەفایی لە ئاستی دەنگسازی‌و مۆرفۆلۆژیشدا کردوونی. بۆ نمونە: لە دێرە شیعری پێشووتریدا لە هەمان شیعردا دەڵێت:

*ماچی دەمی خەندەی دەمەکەی سیرری بەیان کرد*

ئەو جەوهەرە وا فەردە نە مەوجودە نە مەعدوم لەمەدا هەست بە باسی بوونکەرایی دەکەین کە وەفایی خۆی لێ داوەو لەوانەیە شارەزا بووبێ لە وردەکارییەکانی، هەر بۆیە لە دێری دواتردا (کە مەبەستی ئێمەیە) ناوی هەردو فەیلەسوفەکە دەبات. کەر سەرنج بدەین لە دوو دێری دوای هەمان دێردا شتێکی تری سەرنجراکێشتر ئەدرکێنێ:

*لەو زوڵفە بە غەمزەی نیگەهت نیە ڕەهایی*

*من بەستەیی ئێو داوی پەریزادەیی جادووم*

لێرەدا باسی پەیڤی "ڕەهایی" با بۆ خوێنەران جێ بهێڵین‌و خوێنەر خۆی حوکمدەری ئەوە بێت تا چەندێ وەفایی شارەزای فەلسەفەی پلاتۆو ئەرەستو بووە! یان ئەو پرس‌و وەڵامانەی کە لە مێژووی ئەدەبیات‌و ڕۆشنگەریی کۆن و نوێی مرۆڤایەتیدا دیارەو چەندین زانای گەورە هاتوون کەڕاون بە شوێن وەڵامی پرسەکانی وەک: من کێم؟! بۆ هاتوم؟! پەیامم چییە؟! کەی ئەڕۆم؟! حیکمەتی هەبوونم لەم ژینەدا چییە؟! .... هتد.
ئەمانە لەبەر ئەوەی کە مرۆڤ پێویستی بە ئەقڵ و بە تێفکرینە! لەوانەیە سروشت نەتوانێ هەموو ئەو شتانەمان پێ ببەخشێت کە ئارەزووی زانینی پرسەکانمان پڕ بکاتەوە. چونکە ئیرادە کشتییەکانی تاک دوورمان دەخاتەوە لە بەرژەوەندیی کەسیی.
تۆرستێن تۆرین لە مەسەلەی کەڕان بە دوای ڕاستیدا دەڵێت: لە ڕاستیدا گرنگترین شت کە مرۆڤ خۆی بۆ تەرخان بکات، تیۆری زانستیە. تیۆری زانستی لە سەرووی هەموو شتێکەوەیەو بناغەی هەموو دیالۆگێکە، کە تیایدا پرسی گەورەو فراوان، دەکرێ فۆرمولە بکرێ"[11].
دەزانین کە شاعیر یان نوسەر هەوڵ ئەدات شت بنووسێ بۆ ئەو پرسە ئەنوسێت داخۆ بۆی هەیە لە سەرووی ئەم زانیارییانەیەوە شتی تر بزانێت، یاخو ئەمانەی ئەو پێی گەیشتوە تەنیا ڕێژەییەو تا نووکە هیچی نەکردوە. چونکە هەر کەسێک کە بیەوێ سەرکێشی بکات لە زانینی نهێنییەکانی ژیان ئیدی خۆی لەو پرسیارانە ناپارێزێت کە هەڵگری ئەم مەسەلە هەستیارانەن.



١١-- تیۆری زانستی بۆ خوێندکاری نوێ، نوسینی تۆرستێن تۆرین. وەرگێڕانی مەهاباد قەرەداغی. کۆڤاری سەردەم، ژمارە ٢١، ٢٠٠٢، لا ٤٩. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

ئەو زانیویە کە دەتوانێ پرسیار لەو شتانە بکات کەوا پێویستە زانستییانە بکاتە وەڵام تیایاندا. چونکە زانست و لێ توێژینەوە گەیەنەری مرۆڤە بە ڕاستی، ڕاستیش لە ڕوخسارو لە ناوەرۆکی داتاکاندا دەبێت خۆیان دیار بخەن. چونکە بە داخەوە زانینی بوون و ڕەهایی هێندە ئاسان نیە.

دەکرێ ئەم بارە بە ئەقڵانیەتی مرۆڤ ناوزەد بکرێ، چونکە گەڕان بە دوای مەسەلەی ڕاستیدا خۆی لە خۆیدا مەسەلەیەکی ئەخلاقیەو ناکرێ ئەم کێشە هەبووەی مرۆڤ هەروا لە خۆوە لە هزر هەڵاوێرد بکرێ. خۆ ئەگەر بشکرێ، ئەوا ترس لە بەکاربردنی زانست، ڕۆڵی پۆزەتیف وەردەکرێ، بەمەش بازنەی نەبڕاوەی بوون و نەبوونەکە سەر هەڵ ئەداتەوە.

تا لێرەوە خوێنەری ئەم شیعرە، پێی دەکرێت بتوانێت هەندێ لەو ڕاستییانە ببینێت، وەک ئەوەی ئەم تێکستە وروووژێنەری بیرێکی مەعریفیە، ئەگەر ئەوەشی نەکردبێ توانیویە ختووکەی هەندێ بیرۆکە بدات تا ئیمەی خوێنەری شیعرەکە بباتەوە بۆ سەردەمانێک کە کەم جار ئاوڕی بوون و نەبوونیمان لێ داوەتەوە. وەک مەسەلەی ئاڵۆزی ڕەها، کاتێک وابەستەی داوەکانی پەریزادەیەکی جادووباز دەبێ.

**نموونەی دووەم:**

*وەفایی ئیدی بەسە عیشق و هەوای سەردەسە*

*بینووسە ئەم هێندوسە بیبێتە خەت و خاڵی یار"*[12]

هەموو دەزانین کەوا باسی ئەندازەش بە شێوە زانستییەکەی دیسان نیو سەدە دوای وەفایی ئەوجا ئەندازیارمان هەبووە کە لەسەر ئەخشەیەک تان و پۆیەکان دیاری بکات. وەفایی کاتێ ئەندازەییانە مامەڵە لەگەڵ ئەخشەکەی بەردەستیدا ئەکات، وەک ئەو ئەندازیارە وایە کە لەسەر ڕووپێوە هەندەسیەکەی بەردەستی مامەڵە لەگەڵ خەت و خاڵ (پۆو تان)ەکان ئەکات و ئەیانکات بە خەت و خاڵی یارو پێی وایە چی دی لەوە زیاتر پێویست ناکات لێکۆڵینەوەی بۆ بکات و لێی ورد بێتەوە، چونکە گەیشتوە بەوەی کە ئیدی با شێوە ئەندازەییەکەی تەواو بکات.

لویس لانکفۆرد گوتوویە: ئەڵبەتە ئەو فریزانەی کە لە کاتی ئاخاوتنی ڕەخنەییدا دەربارەی کارێکی هونەریی هەڵی دەبژێرین، کارێکەرییەکی دیاریکراو لەسەر چۆنیەتی تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی ئەو کارە جێ دێڵێت. ئەمەش لەبەرئەوەی ڕێنماییەکەلێک لە ئارادان کە شێوازیی ڕەخنەی هونەریی پێک دێنن و هاوکاریمان ئەکەن لە ئاراستەکردنی ڕەوتی دیالۆگی ڕەخنەییدا. تا ئەمە سەرنجی خوێنەران بۆ چەند خاسیەتی دیاریکراوی کاری هونەری ڕادەکێشێت"[13].

شیکردنەوەو هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی دەقێک نیشێنکی گەورەیە، ئەم ڕاڤەکردنە هەندێ جار ئاڵۆزە یان تەم و مژاوی، بەڵام دەشتوانێ هەندێ شێوازی ئاڵۆزی بابەتێک وەدەرخات، چونکە گەر ئاماژەکانیش ڕاستەو خۆ نەبن لە شیکردنەوەو ڕاڤەکاندا، هەر توانراوە بە بەکارهێنانی هەندێ موفرەدات لایەنێ لە چەمکەکان لە بارودۆخی جودادا دیار بخرێ.

ئەفسوونی دەقی زیندووش لەوەدایە کە بە ئەمریی دەمێنێتەوەو بەردەوام دەکرێ ڕاڤەی جیاوازی بۆ بکرێ. وەلێ نابێت ئەوەش لەیاد بکرێ کە کام کەرەسانەی دەقەکە لاوەکین. واتا لە خزمەتی کەرەسەی سەرەکیدان بۆ گەیاندنی مەبەستە کانسەرییەکان"[14].

ئەوەی لێرەداو لەم دێرەدا هەستی پێ دەکرێ ئەوەیە کە خۆشویستن و عاشق بوون بە حەزو ئارەزووەکانی مەعریفە لە دواجاردا بوونەتە کەرەسەی لاوەکی تاوەکو خەتو خاڵی یارە بێ هاوتاکەی، لەوپەڕی جوانی و شێوەی ئەندازەیی و شێوەی دروستی خۆیدا لە هزری خۆی بیهێنێتە دەرەوەو بە خوێنەران بڵێ ئەم بۆیە ئەوەندە عاشقە چونکە مەعشووقەکەی کەلێ لەوەش باڵاترە کە ئێمە هەستمان پێ کردوە. دەبینین سەدری دێڕە شیعرەکە ئامادەکارییە بۆ هەڵبژاردنی بابەتێکی ئارادەیەک یۆتۆپی، ئەویش لە پێناوی پیرۆزکردنی عەشقەکەیدایەو لە عەجزی دێڕەکەدا وێنای مەعشوقە ئەندازەییانە ئەنەخشێنێ بۆمان.

لەم دوو بابەتە هەڵبژێران، هەست بەمانە دەکرێ:

دەبینین چەمکە هەڵبژێراوەکان لە هەردوو دەقەکەدا هێندە هونەرییانە مامەڵەیان لەگەڵ کراوە کە ئاستی شیاوی بابەتەکانی لە خۆ گرتوە. ئەمەش بۆ خۆی مەسەلەیەکی زۆر گرنگەو ئەو گومانانە لا دەبات کە بۆ پاساوی نابابەتی یان تێپەڕاندنی کەمو کووڕی دێتە ئارا. چونکە دەکەمەن ئەم وێناکردن و نیگار کێشانە ئامانج ئەپێکێت.

پابەندبوون بە کرۆکی بابەتەکانەوەو گونجاندنیان لەگەڵ هەر گومانێک کە ئەکرێ پەی پێ ببرێ بۆ ئاراستە کردن و گونجاندنی ئەو داتایانەی کە کردوونی بە موفرەدە بۆ گەیاندنی مەبەستەکانی. کارێ وا وریایی دەوێت، چونکە هەر شێوازێک لەم ڕاستییانە کە دەگیرێتە بەر پێویستی بە زانیاریی لە ڕادەبەدەر هەیە.

لە کۆتاییدا ئەکرێ بڵێم کە ئەم نووسینە لە ساناترین ئاستیدا لەوانەیە بتوانین پێی بڵێین ڕاڤەیەکی بچووکە دەربارەی بابەتانەی لە لایەن وەفایی شاعیرەوە وروووژێنراوە. ئەو پەیڤانەی ئەحمەدی خانی وەبیر دێنمەوە کە فەرموویە:

*لێ هێڤی دکەم ژ موستەعیدان*[15]

*حەرفان نەگرن لە موستەفیدان*[16]

*ئەڤ نامە گەر خراپە گەر قەنج*

*کێشایە مە دگەل وی دوسەد ڕەنج*

---

١٢- دیوانی وەفایی. چاپی دووەم ١٩٨٤، ل ٣٨

١٣ - لانکفورد، لویس. مبادئ الحوار النقدی. النقد الفنی. ترجمە: زیاد سالم حداد. دار المناهل. کبعە الولی، بیروت. ل ٧١ - ٧٨.

١٤- الجمل السرکانیە

١٥ - مامۆستایان.

١٦ -فێرخوازان

# بیرەوەرییەکانی وەفایی

## (( تحفه المریدین ))

گردوکۆی: مامۆستا قازی محەمەد خزر
لە فارسییەوە: محەمەدی حەمەباقی

زستانێک دوو دەرویش میوانی خانەقا بوون. یەکێکیان خەڵکی وڵاتی بوخاراو ئەویتریان خەڵکی وڵاتی کشمیربوو. کابرای کشمیری زۆربەی شەو و ڕۆژ لە خزمەت "شێخ"دا غەزەلی بە مەقام دەچڕی. غەزەلی وەها سەیرو سەمەرەی بە دەنگی بەرزو بە زمانی فارسیو عەرەبی دەچڕی، کە ئەمجۆرە غەزەلانەم لەم ناوچەیە. نە لە کەس بیستبوو، نە لە هیچ کتێبێکیشدا دیبوو. بە ڕاستی دەنگێکی زۆر خۆشو چریکەداری هەبوو. بە تایبەت لە زاراوەی کابولو تورکمانو سەمەرقەندیدا، دەسەڵاتێکی زۆری هەبوو... چوارینەی (١١٥):

من بەندەو گۆیایەی ئەو جۆرە کەسەم کە دەنگی خۆشە
ئەوینی خوداش بۆی بۆتە نواو پۆشاک و پۆشە
بە چریکەی خۆش، هەم دڵ بباتو هەم گیان بیبەخشێت
وەفایی بۆ گیان و دڵسووتاوانیش هەیەو پەرۆشە

ماوەیەک خۆشخوانی ئەو زاتە بوو. کابرای بوخارا-ییش دەنگێکی خۆش و بە سۆزی هەبوو. بەڵام ئەو زاتە قەت داوای مەقامچڕینی لەو کابرایە نەدەکرد. لە کاتێکدا کە ئەو زاتە، خۆی زۆر شەیدای دەنگی خۆش و دڵڕفێن بوو. بەڵام لە ڕواڵەتدا زۆر جێگەی سەرسوڕمان بوو، کە بۆچی جار جارە داوای غەزەل خوانی لەو کابرایە نەدەکرد. ئێمەش سەرمان لە ڕازی ئەم کارە دەر نەدەچوو. تا شەوێکیان ئەو زاتە، نزیکەی چل کەسی لە سادات و خەلیفە و خانەدان و پیاو ماقوڵانی بۆ دیوەخانی تایبەتی خۆی بانگهێشتن کرد. شێخزادەکانی ئەو بنەماڵەیە و کابرای کشمیریش لەوێ بوون، ئەو زاتە فەرمووی دەبێ بانگی کابرای بوخاریش بکەن. ئەویشیان هێنا. ئەو زاتە چەند سەعاتێک لە هەموو بابەتێک، لە وتە بەرزەکانی ئەو بنەماڵە مەزنەی پێشکەش کردین. کۆڕەکەمان بە باسی زانست و حەقیقەت و سەرهەڵدانی چاکە و دارژانی بەخشش و بەرەکەت و بارانی ڕووناکی و خۆشەویستی، دەتکوت کۆڕی ڕۆحانیکەلی جیهانی پیرۆزی سەرەوەیە... چوارینەی "١١٦":

وەفایی دڵێک تەژی سەفا بێ
نوورانی دەبێ، کاتێ لە خزمەت ئەولیادا بێ
سێبەری گڵی ڕەش، چۆن دەبێتە زێڕ
کاتێ کە تیشکی خۆر لە تەکیا بێ

کە ئەو زاتە جارجارە بێدەنگ دەبوو. کابرای کشمیریش بە دەنگی بەرز دەیچڕیکاند و غەزەلی دەگوت. تا زیاتریشی پێدەچوو. دانیشتوانی کۆڕەکەش زیاتر دەکرانەوە و زیاتر گیانی تازەیان تێ دەکەرا. هەر کەسەش لەو شەوی قەدرە، بە کوێردی تواناو شانی خۆی، لە نارەزووی لەش و دنیایی، بەرەو جیهانی ڕوح، دەبزواو هەڵدەفڕی. لەم ڕووەوە وتوویانە: ڕوانینی گەورە پیاوان زۆر بەنرخە و نزیکایەتی کردنیش لە پیاوی عارف، گەنجینەی پڕ لە زانستە... چوارینەی "١١٧":

ئەم بەشە لە دەستنووسەکەدا بەشی سێیەم بوو، کە لەوە دەچێ هەندێک لەم بەشە لەناو چووبێت.

بوخارا: شارێکی دێرین و بەناوبانگی خۆرهەڵاتی "ئۆزبەکستان"ە و کەوتۆتە سەر کەناری ڕوباری "زەڕنەفشان" مانای "بوخارا" بە واتای: پڕ زانست دێت، چونکە هەمیشە زانایان و گەورە نوسەرانی لێ بووە... "لغت نامه دهـ خدا-ل٤٣٩٨-جلد٣))

کشمیر: هەرێمێکی گەورەیە لە هیندستان و کەوتۆتە دامێنی چیا بەرزەکانی "هیمالایا" کە ڕووباری "سەند" پاراوی دەکات، لە ڕووی جوگرافیەوە دەبێتە دوو بەش: بەشی باشووری خۆرئاوای دانیشتوانی زۆرتر تێدایە. ڕووبەری کشمیر "٨٦٠٠٠" کیلۆمەتر چوارگۆشەیە، کە "٣١٢٠٠" کیلۆمەتری چوارگۆشەی ئەم ڕوبارە، کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی پاکستان. دانیشتوانی کشمیر، تێکەڵەیەکە لە ئایینی هیندی و سیک و موسڵمان. پایتەختەکەیشی شاری "سەرنیا کەر"ە... "لغت نامه ده خدا-ل١٨٣٧٤-جلد١٢))

کابول: پایتەختی ئەفغانستانی ئێستایە.

مەیگێڕ بە چاوی بادامییەوە، کە چاو دەگێڕێ
پیرانی هەزار ساڵیش تێیانەداو ناوبانگیان دەڕژێ
هەر یەک تاقە سەرنجێک دڵی وەفایی دەبات
ئەی ئاخۆ چ بکات، ئەگەر مەی بکات لە جام و دەفڕێ؟"

لەم کاتەدا من و بەڕێز "شێخ نوورەدین" و خەلیفەیەکی تر، کە لە نزیک کابرای بوخارایی-یەوە بوو. هەر چەندە بە زۆر تکاو پاڕانەوە، داوامان لێکرد کە ئەویش دەنگ هەڵبڕێ و غەزەلێک بڵێت، بێهوودە بوو، خۆی لێ نەبان کرد. منیش چوارینەیەکی زۆر بە جێ و ڕێم نووسی و پێشکەشی ئەو زاتەم کرد، کە داوای مەقام چڕین لە کابرای بوخارایی بکات، چونکە لە فەرمانی بەڕێزتان دەرناچێت و چەند شیعرێکیان بۆ دەچڕێت. ئەو زاتەش پاش خوێندنەوەی چوارینەکە، پێچایەوە لە گیرفانی پیرۆزی ناو هیچی نەوت. دیسان تکام لێ کردەوە. ئەمجارەش ئەو زاتە هیچی نەفەرموو. چوارینەی "١١٨":

وەفایی، کاتێ ئەو شۆخە، سەوان عیشوەی خۆی نواند
هات مەیخانە و ڕووپۆشی ڕووی خۆی داماڵی و خزاند
ئەوەی کە سیماو ڕوخساری جوانی ئەوی دەبینی
لە پێ دەکەوت و دەم و دەست هەست و هۆشی لێ دەستاند

بەمجۆرەی باسمان کرد، نزیکەی چوار سەعاتێک شەو بەسەر چوو. شێو هات و خوراو دانیشتوانی کۆڕەکە، یەکە یەکە کە بە کاوەخۆ مۆڵەتیان خواست و بەرەو خانەقاو شوێنی دیاریکراوی خۆیان ڕۆشتن و ئارامیان گرت. بۆ سبەینێ بە زیرەکی و پێداگریی زۆرەوە، لە کابرای بوخارایی- مان پرسی: بۆچی لەگەڵ ئەو هەموو تکاو پاڕانەوەی ئێمەدا، لەو کۆڕە دڵخوازەدا، کە وەک بەهەشت وابوو، غەزەلێکت نەچڕی؟ وتی: ئەگەر ئەو زاتە گەورەیەش پێی فەرمووایە بڵێ، نەمدەگوت. ئەوسا ئەم ڕازی بێدەنگی و قروقەپ و ئەمر نەکردنەی ئەو زاتە، بە کابرایی بوخارایی- بۆ دانیشتوانی کۆڕەکە دەرکەوت و بوە هۆی پتر نزیکایەتی. چوارینەی "١١٩":

ئەی شەیدای سیمای جوانی دەردەدو ڕوخساری پەتی
هەتاکو کەی وەکو وەفایی: خوت و زنجیری شێتی؟
بالە خزمەتی پیاواندا، چەندین پەرە بخوێنێت
ئەزانیش وەک بە هەمو ئەوەی کە لە ئاخێتی

زستانێکیش خوالێخۆشبوو: "حەمەمین"ی برام لە خانەقای ئەو زاتەدا خەریکی تەریقەت و چلەکێشان بوو. شەوێکیان لە دوای نوێژی خەوتنان پێکەوە دانیشتبووین. منیش بەو هۆیەوە کە زۆر بیری نیشتیمان و تاسەی ماڵ و منالم دەکرد، بە پێی فەرموودەی پێغەمبەر "د.خ" کە "أولادنا أكبادنا" دڵتەنگی و خەمناکیم دەردەبڕی و بە دەردی دووری پەشێو بووم. چوارینەی "١٢٠":

ڕۆژێک خەمی یار، سەری لێدام و دڵمی داگیر کرد
وەفایی، ئاگر بەربووە خەرمان، هەموو گڕی گرت
دڵ. چونکە ئاگای لە دڵە، بۆیە یار هات و وتی:
ئاهی تۆ بوو، وا داوێنمی گرت و منی بۆ خۆی برد

دەموت ئەگەر ئەم جارە زستان دوایی بێت و بەهار بکات، پێکەوە مۆڵەت دەخوازین و دەچینەوە بۆ نیشتمان و خەریکی کاسبی و کارێک دەبین و ئیتر تواناو تاقەتی ئاوارەییم نەماوە. دە دوازدە ساڵە لە نیشتمان دوور کەوتوومەتەوەو با دووری یاران و خۆشەویستانیش ببڕێتەوە. لەم کاتەدا لە نێوان من و براکەمدا، نوورێکی ڕووناک و بریکەدار دەرکەوت، وەک ئەستێرەی بەرەبەیان دەدرەوشایەوە. چوارینەی "١٢١":

ئەی بت، دووری تۆ، دەردو ئازارو ژانێکی پێدام
وەکو وەفایی، هەم دڵی بردم، هەم گیانی کێشام
وتم گازندە لە بەخت و قژی شێواوت بکەم
گەچی بوو بە داخ، ژیوان بوومەوە، لە قسەی ئەوسام

ماوەیەکیش وەستاو سەبرم کرد، گەرچی ئەم هەست پێکردنەم، بە هەستێکی مینۆکی (مەعنەوی) بوو، بەڵام ئەم بڵێسە نوورانییە، ئەوەندە بریسکەدارو درەوشاوەو تیراوێژ بوو، ڕەنگ بوو بە هەستی ڕواڵەتیش ببینرایە. بە براکەمم وت: کە لەم کاتەدا هەست بەوە دەکەم، ئەو زاتە لەماڵی خۆیان بە دڵ ئاگای لە من و تۆیە. براکەشم چاوی لێک ناو پاش دوو دەقیقەیەک وتی: تۆ ڕاست دەکەیت، وا دیارە ئەم نووره لە تەوەجوهی ئەو زاتەوە بێت، منیش سەبارەت ئاخاوتنی پێشوومان و باسی نیشتمانەوە، پەشیمانیم دەربڕی و ئەوسا وتم: هەتا زیندوو بم، لێرە ناڕۆم، ئەگەریش خوا پێی خۆش بێت دەستبەرداری خزمەتکاری ئەو زاتە نابم. بەهاریش بە نیازی سەردانی نیشتیمان، ئیزن دەخوازم، پاشان بۆ ئەم دەروازەیە، کە ڕووگەو کەعبەی ڕاستانە، دەگەڕێمەوە ناوچاوان لە خاکی دەسوومەوە... لەم باسەدا کە نوورەکە ون بوو. چوارینەی "١٢٢":

وتم ئەی بتم، ڕووی تۆ، بۆ ڕووی من، وەک قیبلەگامی
باڵای بەرزیشت، سوڵی ئاوات و داری هیوامی
قەت نایگۆڕمەوە بە تەخت و تاج و موڵکی پاشایەتی
کاتێ دەفەرموون: وەفایی، هەر تۆ سەگی دەرگامی

پاش تاوێک نۆکەرێک هات و وتی: میرزا ئەو زاتە دەفەرموێت بچینە خزمەتی، براکەشت لەگەڵ خۆت بەیت، بۆمان دەرکەوت کە ئەو زاتە، ئاگای لە هەموو باس و خواسەکەی ئێمە بووە. هەردوکمان بەوپەڕی شەرمەوە چوینە خزمەت پیرۆزی. هێشتا مۆڵەتی دانیشتنمان پێ نەدرابوو. کە ئەو زاتە فەرمووی: میرزا پێم بڵێ لەگەڵ براکەتدا خەریکی چ ڕاوێژێکیت؟ لە بیری چیدایت و ئەمشەو چیتان دەوت؟ ڕاستم پێ بڵێ. چوارینەی "١٢٣":

مامۆستای ئەدەب، یەک ئامۆژگاری خۆی واکرد بە بیان
دەیوت ئەم بەندە چاک بنووسەوە لەسەر پەڕەی گیان
گەر ویستت وەکو ئامە، ڕوورەش و دوو ڕووت لێ نەیەت
وەفایی، وەکو قەڵەم وامەبە، بۆتە دوو زمان

عەرزم کرد: بە قوربانت بم، ئەو کاتەی نۆکەری هەوالدەری جەنابت هات، دەموت لە خزمەت و هاوڕێی ئەو زاتە دوور ناکەومەوەو ئەگەر خوا پێی خۆش بێت، تا دەمرم، لەم دەروازەیەدا جێ کەوشی تۆ ماچ دەکەم، بەهاریش بۆ سەردانی نیشتمان، مۆڵەت دەخوازم و پاش ماوەیەک دێمەوە، ئەو زاتە زەردەخەنەیەکی ئەوەندە دڕێژخایەنی کرد. پاشان ڕەنگ و ڕووی پیرۆزی سور هەڵگەڕاو چاوە پیرۆزەکانی فرمێسکیان تێدا قەتیس ما. دیسان فەرمووی: ئەی بۆچی باسی پرس و ڕاوێژەکەی سەرەتاش ناکەیت؟

عەرزم کرد: بە قوربانت بم، تۆ بۆ خۆت ئاگا لە سەرەتاو کۆتایی باسەکەمان بوو، ئیتر بۆچی شەرمەزارمان دەکەیت و لە گوناهمان نابووریت؟! دیسان بە زەردەخەنەیەکەوە فەرمووی: بۆ تۆ وا چاکە لەلای من بمێنیتەوەو لەبەر چاومدا بیت، خۆ ئەگەریش بڕۆیت، ناتوانیت نەگەڕێیتەوە. ئەم چوارینەیەشی خوێندەوە. چوارینەی "١٢٤":

یار ڕەشمەیەکی وای لە گەردن و ملم کردووە
لە تارو پۆکەی هەر لە ئەویشی خۆی دارشتووە
تاوێک بۆ کەعبەو تاوێک بۆ دەیرم کەمەندکێش دەکا
بۆ هەر جێگەیەک خۆی مەیل بکات، منی بردووە

ڕۆژێکیشیان لە دوای نوێژی نیوەڕۆ. لە حەرەمەوە خواستمی و چوومە خزمەتی و بە پێی فەرمان خەریکی نووسینی پێویست و نووسینەوەی وەڵامی نامە بووم. نووسین زۆر بوون و هەر دوایی نەدەهات. بانگبێژ بانگی عەسری داو ئەو زاتە فەرمووی: من دەچمە خانەقا. تا نوێژی جەماعەت و خەتم دەبڕێتەوە. تۆش نووسینەکانت دوایی پێ بێنە. ئەو زاتە ڕۆشت و من تەنها مامەوەو دەستم بە نووسین کرد. پاش نووسینی چەند لاپەڕەیەک لە پڕ دایکی ئەزیزو میهرەبانی موریدان هات و لە پشت پەردەوە بانگی کردم: ئەگەر برسیتە نان و خوانت بۆ بنێرم. عەرزم کرد: زۆرم برسی نییە، دڵم هیچ نابات. دیسان فەرمووی: ئەگەر جلەکانت چڵکن بوون، با کەنیز بنێرم، بیبان بات بیان شوات. هەر پێویستیەکت هەیە، بیڵێ عەرزم کرد: ئێستا کارو سەرقاڵی زۆرن، با ئەم پێویستیانە بکەونە کاتێکی دیکە. لەم کاتەدا دیسان پارچە نورێکی لە زوهرەو مشتەری ڕووناکترم لێ دەرکەوت و وەک ئەو جارەی پێشوو، کە باسم کرد، لەبەر چاوم دەدرەوشایەوە. چوارینەی "١٢٥":

بە یادی ڕووی ئەو، مانگە لێو تۆشە
لە نیوەی شەوا، هەتاو دەدرەوشا
وەفایی قەدری ئەو شەوی قەدرەی کە پێی ئەزانی
وەک بێ ئەدەبان، دەستی چوو بەناو خەزێنەی بۆشا

هەموو پارچەکانی لەشم. ئەندامەکانی ناوەوەو دەرەوەم، هەر لە پەنجەی پێمەوە، تا تەوقی سەرم، بەهۆی دەرکەوتن‌و درەوشانەوەی ئەم نوورەو کارتێکردنی ئەم نزیکبوونە، نوقمی خۆشی‌و سووتانی یەکپارچەیی‌و شادی بوون. بەردەوام چاوم بڕیبووە ئەو پارچە نوورەو ئارەقم دەڕشت‌و وردە وردەش کاری نووسینم دەکرد. چوارینەی "١٢٦":

*ڕووی ئازیزم دی، بە هەڵوەدایی بە شوێن تیشکا چووم*
*وتی: وەفایی، چی دەکەی، تازە وا من دوور کەوتووم*
*نێرگزەکانیم بینی‌و خۆم نەگرت، کەوتمە سەر زەوی*
*بینەوەی بادەم خواردبێتەوە، مەست‌و خومار بووم*

لەم دۆخەدا بووم، کە دەرگایان کردەوەو خوانچەیەک خواردنیان لە تەنیشتمدا دانا، منیش بەهۆی سەرقاڵی‌و کارو بینین‌و خەریکبوونم بەم پارچە نوورەوە، کە وەک ئەستێرەی دەم بەیانی، ڕووناک‌و درەوشاوە بوو، هۆشبەرو عەشقەدەر بوو، برسێتی‌و نانخواردنم لەبیر نەمابوو، ماوەی ئەم دۆخەو شایەتی ئەم دیدارە، وەک دیار بوو، لە دوای نوێژی عەسرو لە سەرەتای دەست پێکردنی ئەو زاتە بەخەتم، هەتا دوایی هاتنی بەردەوام بوو، کتوپڕ ئەو بلیسەیە لەبەر چاوم ون بوو، لە دوای دوو سێ دەقیقە، ئەو زاتە هاتەوە ماڵ‌و فەرمووی: نامەکانت دوایی نەهاتن؟ عەرزم کرد: نەخێر قوربان. فەرمووی: بۆچی؟ عەرزم کرد: کاغەزەکان زۆرن‌و ئەمڕۆ دوایی نایەن. پاشان فەرمووی: ئەی بۆ نانەکەت نەخواردووە؟ وتم: بە هۆی نووسینەوە دەرفەت نەبووە. فەرمووی: ئەی لەگەڵ کێدا دەدوایت؟ بۆ مێزەرو جلەکانت نەداوە بیشۆن؟ زۆر چڵکنن! چوارینەی "١٢٧":

*دەهای چۆن کە بترسە لەوەی شاباز لێت بدات*
*بە ڕق‌و نازو فیزەوە، تیرێک بە دڵتا بکات*
*ئامان وەفایی وریا بە دڵی یار نەڕەنجێنیت*
*ئەم کردەوەیەت باس دەکاتەوەو بە چاوتیا دەدات*

وتم: بە قوربانت بم. تۆ کە بۆ خۆت دڵی پڕ لە ژەنگ‌و چڵکنی منت پاک دەکردەوە. من ئیتر ئاسوودە بووم‌و هیچ خەمی شتنی جل‌و بەرگم نەبوو. بۆ ڕاستی قسەکەشم شایەتی دادپەروەرو بەڵگەی ڕوناک‌و نورانی هەبوو. بە زەردەخەنەوە لێم نزیک بووەو لە ڕادەی نووسین‌و باس کردن بەدەر، لوتف‌و میهرەبانی لەگەڵ نواندم. بە دەستی موبارەکی خۆی عەمامەکەمی لە سەرم هەڵگرت‌و عەمامەکەی سەری خۆی، کردە سەرم..... هەوایەک لە سەری دام، وەک ئەوەی مێزەری لاوێتیم لەسەر کرابێت. هەرچەندە خۆ بە کەم زانینم نواندو خۆم لادا، کە خاکی پیرۆزی بەر پێت، نیشانی سەرمەو شایەنی عەمامە نییە، قبوڵی نەفەرموو عەرزم کرد: کەواتە شایەنی سەری وا کەورە نیم. لوتف بفەرموو بچکۆلەی کەرەوە. دوایی بە دەستی موبارەکی، عەمامەکەی کردە دوو کوت‌و نیوەی لە سەری من بەست‌و نیوەکەی تریشی لە تاقێکدا دانا عەمامەیەکی تری لە تاقەکە داگرت‌و لەسەری پیرۆزی کرد. چوارینەی "١٢٨":

*پیاوانی خودا، بە چاوی دەروون ئێمە دەبینن*
*وەفایی، نامە، هەر لە خواوە هەمووی دەخوێنن*
*دیارو نادیار، ئاشکراو پۆشراو، لایان وەک یەکە*
*چونکە بە نووری خواوە دەنوارن، خۆیان دەنوێنن*

ساڵێکیشیان لە وەرزی زستان‌و لە مانگی ڕەمەزاندا، کردەوەیەکی پێچەوانەی، تەریقەتی پیاو چاکانم لێ قەوما، جگە لە کردکاری مەزن. کەس ئاگای لێ نەبوو هەرچەند غوسڵ‌و تۆبەو پەشیمانی‌و دادو هاوارو داوای لێبووردنم دەکرد، ئەو دڵڕەقیەی کە بە هۆی ئەو کردەوەیەوە، لە دڵمدا ڕسکا بوو، ببووە هۆی کاسی‌و وڕیم‌و لانەدەچوو.
ماوەیەکیش بە کریان‌و شیوەن‌و ددانە چۆقە. لە ناو ئاودا مامەوەو کڕنوش‌و زەلیلیم کرد، ئەو خەوشە نەوەندە. لە دڵم دەرنەدەچوو، کە ببێتە هۆی هێور بوونەوەی کیان‌و کرانەوەی ڕواڵەت‌و دەروونم. چوارینەی "١٢٩":

*ڕۆژێک بە هەڵە، یادی پەرچەم‌و زوڵفی یارم کرد*
*ناوێتەی سیاو ڕوخساری جوانی، خێرا ژەنگی گرت*
*ڕووی خۆی دەرخست‌و خۆی لە وەفایی ئەبان کرد. ڕۆیی*
*یار هات‌و ڕۆژ هات، شەو بە بار ڕابورد*

بە ناچاری بە دڵی پڕ خوێنەوە، لە ئاوەکە هاتمە دەرێ‌و بە هەزاران داخ‌و پەشیمانییەوە ڕووم کردە خانەقا. بەفرێکی زۆر باریبوو، بەردەوامیش هەر دەباری، کە خۆم بە ژووری خانەقادا کرد، ئەو زاتە ڕوو لە قیبلە، لە میحرابدا دانیشتبوو. باش لە بیرم نییە لەو کاتەدا ئەو زاتە قورئانی پیرۆزی دەخوێند، یان "مراقب" بوو! منیش چونکە نەحەساوە بووم‌و زۆریش سەرمام بوو، بە لەرزە لەرزو ددانە چۆقەی زۆرەوە، بە کارەحتۆو بە شێوەیەک کە ئەو نەمبینێت! لە ئاگری ژووری خانەقاکە نزیک بوومەوەو دانیشتم، هێشتا تینی ئاگرەکە باش لێی نەدابووم، کە ئەو زاتە سەری پیرۆزی بەرز کردەوەو ڕووی تێ کردم‌و گازی کردم: وەرە لامەوە لەو کاتەدا خانەقا لە موریدو پیاو خاس‌و زاناو مەزن‌و خەلیفە، جمەی دەهات، هێندێک خەریکی خوێندنەوەو کۆمەڵێک خەریکی دوعاو چەند کەسێکیش خەریکی کاری تەریقەت بوون، لەگەڵ بانگکردنەکەی ئەو زاتەدا، هەموو تێکڕا سەریان بەرز کردەوەو چاودنواڕ بوون بزانن ئەو زاتە، چیم پێ دەڵێ! منیش خێرا بۆم دەرکەوت کە ئەو زاتە، لە بارو دۆخەکەی من کەیشتووە، بە ترس‌و لەرزو شەرم‌و سەرداخستن چوومە پێشەوە. فەرمووی: وەرە پێشترەوە، نزیکتر بوومەوە، دیسان فەرمووی: وەرە پێشترەوەو، چەند هەنگاوێکی تریش نزیک بوومەوە، دیسانەوە فەرمووی: وەرە پێشترەوە. هەتا هەردوو ئەژنۆم لە هەردوو ئەژنۆی موبارەکی جووت بوون ئەوسا فەرمووی: بۆ ئاڵۆزاویت! چوارینەی "١٣٠":

*وتم: لە دەست زوڵف‌و پەرچەمت وا پەرێشانم*
*هەڵوەدا بووم‌و شپرزەو شێواو، هەر سەرگەردانم*
*پێکەنی وتی: وەفایی یانی گوڵ شەکر بکەرە*
*کورج کە بووەتە دەوای دەردی تۆو بۆ تۆ دەرمانم*



ئەوەندە شەرمو خەجاڵەتیم دەخوارد، وەڵامم پێ نەدرایەوەو سەرم داخست. دیسانەوە هۆی ئاڵۆزاویو سەرسامییەکەی لێ پرسیم. منیش بە هەوای ئەوەی ئەم بێ ئەدەبییەم بە چاودا ناداتەوە، بێ ئەدەبتر بوومو بە هەڵە وتم: ئاڵۆزیو ترسو بیمم، بە هۆی کارو باری خەتمەوەیە. دانیشتوانی خانەقاش بە سەرسامیەوە چاویان بڕیبووە ئێمەو هەموویان چاویان کردبوو بە چوار. ئەو زاتەش بە تەوەجوە کردنێک، هەموو دڵڕەقییو ژەنگو ژاریکی لێ سڕیمەوە. چوارینەی "١٣١":

وتم: گەر شەوێک بە ئاسوودەییو دڵشاد بتبینم
بۆت هەڵدەڕێژم هەموو پەژارەو خەمی دێرینم
لە بەختی باشی وەفایی، وابوو ڕوخساریم بینی
نیتر بە باچوون، دادو گازندەو سکاڵای ژینم

پاشان فەرمووی: فلانی، بەندەکانی خوا، ئاگاداری بەزەییو لوتفو لێبوردنی خوای پاکو مەزن نین! کە چەند زۆرو بێ کۆتایو بێ برانەوەن. ئەو گوناهەی تۆ کردوتە، لەو بارەگا پاکو مەزنەدا، هیچ کەلێنێک ناگرێت. مەترسەو خەمناک مەبە. بەڵام بە ئەدەب بەو ڕێوشوێنی ئەدەب لەبیر مەکە. جارێکی دیکەش نابێ ئاوا بێ ئەدەب بێت. ڕاگرتنی ئەدەب، دەبێتە هۆی نزیکایەتی زیاتر، منیش دەستی موبارەکی ئەو زاتەم زیارەت کردو بە ئاسوودەیی هەستام. چوارینەی "١٣٢":

ئەرێ ئەی بەندە، وەفایی، دڵت بۆتە دوو نیوە
گەیلە لە ترسی، دۆزەخو گێشەی لێپرسینەوە
گەرچی گوناهت زۆر زۆرو گەورەو گرانە
هیوا مەبڕە چون خوا میهرەبانو پڕ بەخشینەوە

هەمیشەش کیسەو مۆری موبارەکی ئەو زاتە، لە لای من بوو. هەندێ جار بۆ مۆر کردنی نامەی نهێنی، کە بە خەتی موبارەکی خۆی دەینووسین، کیسەو مۆرەکەی لێ وەردەگرتمو دەیدامەوە....... ڕۆژێکیان بە دەستی موبارەکی کیسەو مۆرەکەی دامەوە. نووسینێکی زۆرم بە سەردا کەوتبوو. پاش ئەوەی تەشریفی ڕۆشت. گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمو دەستم بە نووسینی ڕەشنووسی نامەکان کرد. تا نامەکان بە مۆری پیرۆزی مۆر بکەم. دیم ئەشرەفییەکی زێڕی فەتح-عەلی-شایی لە ناو کیسەکەدایە. سەرم سوڕ ما! دەبێ ئەم ئەشرەفییە زێڕەی بۆچی لەم کیسە نابێت؟ قەت شتی وا ڕووی نەداوە خۆ ئەگەر بۆ تاقیکردنەوەم بێت، ئەو زاتە هەر خۆی لە ڕۆژی یەکەمەوە چاکەو خراپەمی تاقی کردۆتەوەو دڵو چاکەی منی لە مەحەک داوەو کردویەتیە زێڕی بێ خەوش. چوارینەی "١٣٣":

وتم: ئەی بتم، ڕووی شیرینی تۆم ئاوا خۆش دەوێ
لەگەڵ ڕوخساری تۆدا، بەهەشتی ئاوام بەرکەوێ
خۆزگە دەخوازم کە هەر وەفایی لە دەورت گەڕێ
فەرمووی: منیش هەر ئاوام پێ خۆشە، ئەگەر بۆم بلوێ

پاش سەعاتێک، کە نامەکان تەواو بوونو مۆر کران. نۆکەرێکی حەرەمم بانگ کردو ئەشرەفییەکەم دایە دەستی، تا بیبات بیداتەوە بەو زاتە. لە پاش دوو و سێ ڕۆژ، ئەوسا بیرم کەوتەوەو بەو زاتەم ڕاگەیاند. کە ئەشرفییەکی زێڕ، لە ناو کیسەی مۆرەکەدا بوو فەرمووی ڕاست دەکەیت ئەی چیت لێ کرد؟ عەرزم کرد بە فلانی دا ناردمە خزمەت بەڕێزت. فەرمووی: کەس نەیداومێ. پاشان نۆکەرەکەی گاز کردو پرسیاری سپاردەکەی کرد. عەرزی کرد: میرزا ڕاست دەکات. بەڵام ئەو کاتەی دەمویست ئەشرەفییەکەت بۆ بەڕێزتان بهێنمەوە، بیرو هۆشم لە لای خۆم نەبوو، نازانم لە کوێ لە دەستم داکەوتووەو لێم بزر بووە. نۆکەرەکە کێڵو کەوجایەتی دەنواند. کەم ئاوەزو ساویلکە بوو. ئەو زاتەش فەرمووی: بچۆ تەویلەی ئێسترەکان بکەڕێ. چوارینەی. "١٣٤":

ڕۆژێک چوومە باخ، تا خەمی دڵم کەمێک بە با چێ
بە سەد نازەوە یار شەرمەزاری کردم دەستبەجێ
بە وەفایی وت: شەرمت بە خۆت بێت، چۆن ئەبێ ئاوا
وەنەوشەو بسکم، یان گوڵو ڕووی من، دەکەیت بە یەکێ؟

نۆکەردکە ڕۆیشتو لە پاش تاوێک گەڕایەوە، وتی: ئەمدۆزییەوە. دیسان ئەو زاتە فەرمووی: بچۆ بە وردی تەویلەکە بپشکنەوە. دووبارە خزمەتکاردکە ڕۆیشتو هەمدیسانەوە بە دەستی بەتاڵ هاتەوەو وتی: زۆری بۆ گەڕام لە تەویلەکە، نەمدۆزییەوە. بۆ جاری دواتر لەو جێگەیەی ئەو زاتە فەرمووبووی، ئەشرەفییەکەی دۆزییەوەو هێنای دایەوە خزمەت ئەو زاتە. چوارینەی "١٣٥":

وەفایی چاوت. کە وەک دڵۆپە بلقی سەر ئاوە
وەرە سەروانە، چاو بپۆشە لێی، بیخەرە لاوە
ئەگەر دەرزییەک بکەوێتە ناو ئۆقیانووسەوە
بیدۆزەرەوە. هەتا لە چاوت دیارە ئەو چاوە

ڕۆژێکیشیان دوو کەسیان لە کەس و کاری کابرایەکی کوژراو ، بە تاوانی پیاو کوشتن هێنایە خزمەت ئەو زاتە. ئەو زاتە فەرمووی: بۆچی ئەم بەستەزمانەتان کوشتووە؟ حاشایان لێ کردو سوێندی گەورەیان خوارد، کە ئەگەر لەتیشمان دەکەن، ئێمە ئاگامان لە هیچ نییە. لە پاشان ئەو زاتە فەرمووی: هەردووکیان بەرن، زیندانیان بکەن، بەڵکو سبەینێ دداني پێدا بنێن. بە پێی فەرمان هەردووکیان کەلەپچە کردنو زیندانیان کردن. چوارینەی "١٣٦":

دڵ ببوە شەیداو عاشقی زوڵف و پرچی پەرێشان
ببوە مایەو هۆی دڵ ئازاردانی یاری گیانی گیان
وەفایی گەرچی لە ڕواڵەتدا، خوێنی نەڕشتبوو
بەڵام ئەم شەیداو عاشقە ببوە شیاوی زیندان

بۆ سبەی بە پێی فەرمانی ئەو زاتە، هەردووکیان هێنایە خزمەت. ئەو زاتە فەرمووی: بۆچی ئەم بەستەزمانەتان کوشتوە؟ ئەوانیش پێیان لێ ناو کوشتنەکەیان دەرخستو وتیان ئێمە کوشتوومانەو حاشای لێ ناکەین. لێیان پرسین: ئێوە بۆچی خۆتان بە زمانی خۆتان هاوار دەکەنو ڕاستی دەڵێن؟ وتیان: ئێمە دەمانەوێ بڵێین ئێمە ئەمان کوشتووە. کەچی هەرچی دەکەین زمانمان نایهێنێو جگە لە وتنی ڕاستی، هیچ شتێکی ترمان بە زماندا نایەتو ناوترێتو لەم ددان پێدانانەدا هیچ دەسەڵاتێکمان نییە. چوارینەی "١٣٧":

وەفایی. ئائەو یارەی وا پیاڵەی مەی لە دەستایە
دێ و دەچێ و لە ناو کۆڕی مەیخۆرو مەی پەرستایە
جارێک بە تیلەی چاو هەڵئا دەکا، جارێکیش لێوە
مەی پەرستەکەی بەزمی دەگێڕێ، بەزمی مەستایە

لە دواییدا کاربەدەستانی حکومەتی عوسمانی بە پێی یاسای دەوڵەتی پایە بەرز، هەردووکیان ناردن بۆ ناوچەی "وان"و زیندانو کەلەپچەیان کردن. پاش ماوەیەک یەکێکیان لە زیندان مردو ئەوی تریشیان توانی خۆی لە زیندان دەرباز بکاتو هەڵێ. چوارینەی "١٣٨":

بیبگە لە دۆستان، وەفایی هەرچی کە ئارەزووت هەن
دەستبەرداریان بە، ئەمانە بۆ تۆ، هەموویان هەڵەن
وریا بە ڕەوەو دەستو زمانیش لە فەراپە بشۆ
هەر ئەم زمانو دەستە، شایەتی لە کارت دەدەن

ساڵێکیشیان لە هاویندا، ئەو زاتە بۆ گۆڕینی ئاوو هەوا لە نەهری، ڕووی کردە هاوینە هەواری مەیدانان. هاوینە هەواری مەیدانان، زوزانو هەواری ئەو زاتە بوو. نزیکەی دوو مانگ لەو شوێنە فێنکو خۆشو پڕ لە کانیاوی سازگارو ساردە مایەوە. دوایی لەوێوە بەرەو نەهری بەڕێ کەوت. کۆمەڵێکی زۆری موریدو دەستو پێوەندو خزمو کەسو کاری، هاورکێفی بوون، هەتا گەیشتە گوندی پیسان ئەم گوندە شوێنی جووتو گاو مەزرای نیوە کارەکانی ئەو زاتە بوو. بۆ نیوەڕۆ لەوێ بارگەو بنەیان خستو هەر کەسەو بە کارێکەوە خەریک بوو. چوارینەی "١٣٩":

پەپوولەیەک وای دەوت بە شەمی شەوقی گوڵ گەم
نەزانی چۆنەو ئاگات هەیە لە ناوو گڵ گەم
بشنوانەوە دوا بۆ حاڵ گەی من. فەرمووو وەفایی
بە هیچ جۆرێ بە ئازاری ئەدری و ئەشانی دڵ گەم

ئەو زاتەش بە تەنیا بەرەو ئەو بێستانەی چێنراوو خزمەتکرا بوو، بە پێیان و زۆر بە کاوەخۆ، بەڕێ کەوت. ئەو زاتە کازی کردم، منیش چوومە خزمەتی ئەو زاتە.

پۆستینەکەی لە خۆی کردەوەو هاویشتیە سەر کا-کەسێکی شەنکراو، فەرمووی ئێرە شوێنێکی خۆشو دڵگیرەو لە ئاپوورەکەش دوورین. وەرە دانیشە فەرمانیم بەجێ هێنا. دوای دوو سێ دەقیقە هەستاو فەرمووی: تۆ شاری -تو زیرەکیت، منیش کرمانجو لادێیم. وەرە با بچینە ناو ئەو بێستانەو بگەڕێین، بزانین منو تۆ کاممان گرکەی شیرین هەڵدەبژێرین! چوارینەی "١٤٠":

مەیکێڕ. کە دەمو لێوی خونچەیەو ڕوویشی نەسرینە
ئەلقەی بسکیشی هەزاران تونیەو هەزاران چینە
بە گەرەمی خۆی، هاتو جامێکی بە وەفایی دا
زانی ئەم جامە. گەرچی تاڵیش بێت. بۆ ئەو شیرینە

ئەوسا تەشریفی بردە ناو بێستانەکەو تاوێک تێدا گەڕا، منیش لەم لاوە چاوم بە گرکەکاندا دەگێڕاو بە عەقڵو هۆشی خۆم نزیکەی حەوت-هەشتێکم لێ کردەوەو کردمنە کۆشمەوەو هاتمەوە. ئەو زاتەش چوارێ لێ کردەبۆوەو بە باوەشی پیرۆزی هەڵی گرتبوونو هێنانی، بانگی کردم: وەرە با بچینەوە شوێنەکەی خۆمانو گرکەکان لەت بکەین، بزانین شاری گرکەی شیرین دەناسێ، یان من!؟ لەو کاتەدا، کە هێشتا لە بێستانەکەدا بووین، ئەو زاتە تاوێک بە سەرسامییەوە وەستاو ڕەنگو ڕووی پیرۆزی گۆڕا بە چەشنێک دەتگوت هەزار چەپکە گوڵو هەڵاڵە سوورەی پشکوتووەو چاوە پیرۆزەکانی مەستو نازو سوورو پڕ ئاو بوون. ڕەنگو ڕوی وەکو گوڵزاری بەهەشتی لێ هاتبوو. دەمویست لەو کاتە

پڕ لە خۆشەویستی‌و نائارامییەدا، هەموو گیانی قووت بدەم‌و بە ددان بیکرۆژم. چوارینەی "١٤١":

ئەو کاتەی مەیگێڕ، هەنگاوی بەرەو پێشەوە دەچوون
بە دەرکەوتنی، سەد باخی ئیرەم، سەوز بوون، پشکوون
پێکەنینەکەی دوو سەد وەفایی هێنایە کایە
عیشوەو نازیشی وای کرد: هەزاران مەستی عەدەم بوون

ئەوسا فەرمووی: میرزا، گوێت لێیە خوای پاک‌و مەزن، چی دەفەرمووێ! وتم: لە دەورت گەڕێم، نە هۆشم هەیەو نە گۆش. فەرمووی: هەق تەعالا دەفەرمووێ: تۆ باش من ناناسیت. وەک وتوویانە: زمان خامۆشە بەڵام دەم پڕ لە عەرەبی. زمانی پیرۆزی ئەو زاتە پڕ لە وتار بوو-و زمانی وەستاو قسەکانی تری چوونە پەردەوە. چوارینەی "١٤٢":

مەیگێڕ، کە وێنەی ناو جام و بادە، سەرمەستی کردی
گوڵڕەنگ بوویت، ئەست بووی، بە هەستی کردی
پیاڵەیەکی هەر لەو بادەیەی خۆت دات بە وەفایی
سەرخۆش‌و مەستو بوو، ئاوا لە دەست چوو لە دەستی کردی

لە دوای ئەم وتەیەی، دیسان ڕەنگ‌و ڕووی پیرۆزی بە جۆرێکی تر، زەردو سپی‌و لاواز هاتە پێش چاو. لە پاش دوو-سێ دەقیقە، کە ئەم حاڵ‌و هەوایە بە سەر چوو، فەرمووی: تۆ گوێت لێ بوو، ئاگادار بویت، من چیم وت؟ عەرزم کرد: بەڵێ. فەرمووی: چیم وت؟ وتم: شتێکی ناوام لە زمانی پیرۆزت بیست فەرمووی: سبحان الله. ئەمە چ هەڵەیەک بوو من کردم! بۆچی هێشتت؟ پاشان چەند جارێک داوای لێبوردنی خواست‌و فەرمووی: ئەو کاتەی من زیندووم، لای کەس باسی نەکەیت. چوارینەی "١٤٣":

ڕۆژێک ئەو پیرو شێخی مەیخانەم چاو پێکەوتەوە
دەستی وەفایی گوشی و باوەشی خۆی بۆ کردەوە
لەو بادەیەی وا، پڕ بوو لە ڕازی پێشینە و "ألشت"
جامێکی دامێ‌و نیشانەیەکی خۆی تیا هێشتەوە

ئەوسا لەسەرخۆ بەرەو دەری بێستانەکە بە ڕێ کەوتین‌و لە بێستانەکە هاتینە دەرەوە. ئەو زاتە لە سەر پۆستینەکەو کا-گەنمەکە دانیشت. منیش لە بەردەم ئەو زاتە، لە سەر زەوی دانیشتم. کەسمان لە دەور نەبوو. کەس ئاگای لە ئێمە نەبوو. چونکە هەر کەسەو بە کاروباری ئەسپ‌و کوێدرێژو شوێنی حەوانەوەو دانیشتنی خۆیەوە خەریک بوو. پاشان ئەو زاتە فەرمووی: تۆ گرکەکانی خۆت لەت بکە. یەک یەک لەتم کردن‌و لێم چەشتن. ئەگەر چی بە ڕەنگ‌و ڕوو دەبوایە وەک شەکر شیرین‌و مەزەدار بوونایە، کەچی تامیان وەکوو ئاوو کا ساردو ناخۆش بوون‌و یەک لە یەک خراپتر بوون. ئەو زاتە، بەو لەتلەتکردن‌و چەشتن‌و فڕێدانەی من بەردەوام پێدەکەنی‌و دەیفەرموو: شاری! گوانی زیرەکییەکەت! دوایی ئەو چوار گرکەیەی بە دەستی پیرۆزی لێی کردبوونەوەو هێنابوونی. لەت لەتی کردن‌و لە هەر کامەیان کووزێکی لێدەکردنەوەو پاکی دەکردن‌و بە دەستی پیرۆزی دەیدایە دەستم‌و دەمخواردن. لە تام‌و بۆن‌و شیرینی ئەم گرکانە، سەرسام بووم. چوارینەی "١٤٤":

ئەگەر چی گوڵجار، گوڵ و ئەسرینی زۆری پێوەیە
ئەم هەموو ڕەنگەش، هەر لە بەخشینی خاکێیوەیە
مایەی پەسەندیی ئەو یارە خەندە شەکرینەیە، وا
وەفایی-یش ئاوا، ئەمجۆرە شیعرە شیرینەی هەیە

دیسان بە زەردەخەنەوە دەیفەرموو: تۆ شاریت‌و منیش کرمانج! عەرزم کرد: لە دەورت گەڕێم گرکەکانی من هەموویان گرکەی شیرین بوون. بەڵام بە سیحرو فێڵی پیرانەو تەردەستی شێخانە، شیرینایەتی گرکەکانی منت کێشاو لە گرکەکانی خۆتت کردن. بە کورتی چۆنت بوێت، وا دەبێت. لە دواییدا لە هەموو لایەکەوە جەماوەر کۆ بوونەوەو باسەکە گۆڕا. چوارینەی "١٤٥":

نازی چاوان‌و بسکەکانی تۆ، هەر ئاوا بووە
ئەی گیانی وەفا، ئاژاوەی چین-یش وا بەرپا بووە
موعجیزەیەکی پێکەنینەکەت ئەوەیە، کەوا
گوڵ، ژەهریش بوو بێت، بە سۆنگەی تۆوە، لە هەنگوین چووە

ساڵێکیشیان لە سەرەتای هاویندا، بە هۆی گەرمای زۆری ئەهری و ناخۆشی ئاوو هەوای ئەو ناوچەیەوە. ئەو زاتە لەرزو یاوی تووش بوو. چەند ڕۆژێک بەڵغەم‌و ناسازی‌و کەم هێزیی هەڵی کوتایە سەری‌و بڕستی لێ بڕی. چوارینەی "١٤٦":

بە نازیزم وت: ئەری ڕەنگی من، بۆچی وا زەردە؟
هەمیشە ژینی وەکو وەفایی پڕ داخ‌و دەردە
ڕووی خۆی دەرخست‌و بسکی ئاڵۆزو لوولی شاردەوە
واتە: دەرمانت، هەوا گۆڕینە، لەو کەژو هەردە

ناچار بۆ گۆڕینی ئاوو هەوا، ڕووی کردە دەڤەری "مەیدانان"ی بە زێڕ کڕراوی تایبەتی خۆیان. جەماوەرێکی زۆریشی لەتەکدا بوو. چوارینەی "١٤٧":

بەو بتەم وت: لە تاو دووریتە، هاوار دادم
لە بەر شیرینی پێکەنینەکەت، وەکو فەرهادم
پێمی وت: لە ناو ئاوێنەدا بوو، وەفایی-م بینی
دەبێ بە چاوی خۆمەوە بوو بم، هەر وایە یادم

لەو سەفەرەدا جەنابی بەخشندە خوێ، یەکتای دەوران، تاقانەی جیهان، خوالێخۆشبوو، مەلا عومەر ئەفەندی ڕەواندز-یش لەگەڵ کۆمەڵێ فەقێ تەشریفیان هێنا. کاتێ گەیشتینە ئەو دەڤەرە، لە سێ شوێندا چادریان هەڵدا، یەکێکیان بۆ ئەو بەڕێزەو فەقێکانی‌و چادرێکیش بۆ چێشتخانەو چێشتکارەکان‌و چادرێکی تایبەتیش بۆ

ئەو زاتەو کەس و کارو من و سەید عەبدولڕەحمان. ئەو زاتە نۆکەرو دەست پێوەندو مەحرەمی لەوێ نەبوون و لە ناو کۆمەڵی موسافیرەکاندا تەنیا نیمە "دوو مارمێلک" یاری غاری ئەو بووین. کە شەو دادەهات و جێگەی خەوی ئەو زاتەمان ڕادەخست و لە پاش دوعاکردن و بە جێهێنانی فەرزی هەمیشەیی؛ دەنووست و دەحەسایەوە. تا دەمەو بەیانی، من و سەیید، بە نۆبە دەخەوتین و هەڵدەستاینەوە. چوارینەی "١٤٨":

وەفایی بێ یار، گوڵ و گوڵزاریش وەک دڕک جارە
... یاریشدا، گوڵ ... شووره‌یی و عارە
لە ناو ئایینی ئەڤینداراندا، باوە، وا دەڵێن
لە هەر جێگەیەک دڵداری لێ بێت، هەموون گوڵزارە

نزیکەی دوو مانگ و نیو "زیاتر یان کەمتر". لەو هەوارە ماینەوە. بە ڕاستی شوێنێ وا خۆش و سازگار، شوێنێ وا خۆش و خاوێن لە هەموو ناو چیادا بەدی ناکرێ. کانیاوەکانی بە ڕادەیەک ساردو خۆشن، کە هەرگیز نەمتوانیوە لە سەر یەک، سێ قومی لێ بخۆمەوە. بە تایبەتی چەمی نزیک ئەو ناوچەیە، کە بەناو دەربەندی چیا سەرکەشەکاندا تێدەپەڕێت. هەتا دەگاتە سنووری سنجاقی ڕەواندز، ئەمبەرەو ئەوبەری، بە پانایی سەد گەز، هەمووی گوڵزارو هەڵاڵە جارە. هەر لە بەهارەوە، تا دوو مانگەی هاوین. ئەم دیمەنە وەک بەهەشت ڕەنگینەو هەر ئەو جۆرەش دەمێنێتەوە. چوارینەی "١٤٩":

لە بەهاراندا ویستنی باخ و ناو گوڵجار خۆشە
مێرگ و چیمەن و هەوای زوزان و لای ئیزار خۆشە
وەفایی بە خوا، ئەمانە ئەگەر وەک بەهەشتیش بن
سەیری گوڵشەنی وا سازکاریش لەگەڵ یار خۆشە

لە سرودیان فێنک و ئاوی ساردو سازگار، بۆنی هەڵاڵە جارو ڕیحانە گیرتەو کوڵی هەمە جۆرەو هەزاران چەشنە کوڵاڵەو مێخەک، دنیایەک سۆسنەو گەزیزەو وەنەوشەو چرۆی دەم بە پێکەنین. کە ڕۆژەرێیەک لە کوێ چەمەکە ڕوان و پشکووتوون. مرۆڤ مەست و سەراسیمە دەبێت. ئەو زاتە جار جارەو ڕابواردان، لەگەڵ جەماوەرێکی زۆردا، ڕوویان دەکردە ئەم شوێنە. کاتێ لە ناو ئەو مێرگ و چیمەنەو لە ناو ئەو شوێنە دڵگیرەدا. لە کوێ چەمە فێنک و خۆشەکەدا، دادەنیشت و لە هەر چوار دەورەوە، ئەولیاو زاناو موریدو خەلیفەکانی ئەڵقەیان دەبەست. ئەو زاتە بە ئارامی باسی زانستی عیرفانی دەکرد. چوارینەی "١٥٠":

... جوان و بەدەفەر ... هاتە فەرابات
گیانی مەیخوران هاتە جۆش و کوڵ، بوو بە ...
هەر کەسێ لەعلی گیان پەروەردەکەی بە چاو دەبینێ
... دەبووە وەفایی و بێهۆش ...

گوێگرانیش بە کەمالی دڵ و دەروون، گوێیان بۆ شل دەکرد و ... دەهاتنەوە سەر خۆ. خۆش و خرۆشێکی وا بەرپا دەبوو، وەک ... هەڵدەسێنێت. وابوو.

سەرەڕای ئەو هەڵاڵەجارەو جوانیی ئەو میرگوزارە، بە هۆی ڕوخساری جوانو نووری کەماڵی ئەو زاتەوە، کەس کوێی بە مەیلی ڕابواردنی ناو هەڵاڵەجار نەدەداو ناهەقیشیان نەبوو. چوارینەی "١٥١":

ئەو شۆخەی ڕووی خۆی ئاگورێنەوە بە ڕووی تابان
هیچ ئەڤینداریک نییە گیانی خۆی نەکات بە قوربان
بۆ چاکەی چرا، وەفایی ئەگەر پەپوولە هەردەم
خۆی ئەسووتێنێت چی دی لە دەست دێت، بێجگە لە گیاندان

لەو شوێنەی کە جێی دەرکەوتنی نووری یەزدان، لەو پەیکەرە ڕۆحانییەدا کە ئاوێنەی درەوشانەوە بوو. وەک ڕۆژی ڕووناک، ڕوون و ئاشکرا دەبینرا، ئیتر لە بەرامبەر ڕووخساری خاوەن کەماڵی ئەو زاتەدا، هەوای گوڵجار و ئارەزووی ڕابواردنی ناو باخو بێستان، لە کوێ دەما! ئەم هەموو گوڵو گوڵزارە، هەڵاڵەش و دڕکەڵانی دەنواند. دەمەو ئێواران بەرەو شوێنی حەوانەوە دەهاتنەوە و وەک خۆر، سوارەو پیادە، وەک ئەستێرە لە دەوری بەرو هەوارکەکە دەبوونەوەو دەهاتنەوە. غەزەل:

ئەی خۆزگەم بەو دەمو ساتە، ئەی خۆزگەم بەو ڕۆژانە
ئەی خۆزگەم بەو خۆشی و باروودۆخە. ئەی خۆزگەم بەو کاروبارە
ئێمە بە سەر ئەسپی گیانبازی و ئەو لەسەر تەختی زانست
ئای لەو خۆشی و شادییەی ئەو سوار بوو، ئێمەش سوار
ئەو سروودی عەشقی دەچڕی. ئێمەش سروودی عاشقی
ئەو وەکو گوڵی دەم بە پێکەنین دەپشکووت، ئێمەش وەک و بولبولی بێ قەرار
ئەو سەد دەرگای نوورو ڕووناکی لێ کردینەوە
ئێمەش سەد دڵ و گیانی بە قوربانمان خستە بەر پێی ئەو
وەک وەفایی بێ قەرارم، ئەی موتریب تارێک لێ بدە
گیانو دڵم لە ئاگرا دەسووتێ. مەیگێڕ سا ئاوێک بێنە

ای خوشا ان وقت و ساعت . ای خوشا ان روزکار
ای خوشا ان وجد و حالت . ای خوش ان کاروبار
ما بر اسب جان نپاری او بە تخت معرفت کفتی
یاد باد ان شوق و شادی . او سوار و ما سوار
او سرود عشق کفتی . ما سرود عاشقی
او چو کل خندان شکفتی . ما چو بلبل بی قرار
او بە روی ما کشودە لە در نورو چیا
ما بە جانی او نمودە لە دل جان نپار
چون وفایی بی قرارم . مکربا تاری بزن
جان و دل مصروق نارم . ساقیا ابی بیار

لەو دەمانەدا، شەوێکیان خەریکی ئێشککرتن بووم، کاتێ بەشێکی شەو تێپەڕی، هاوڕێکەمم هەستاندو تێم کەیاند کە نۆرەی هەستانی ئەوو خەوتنی منە. ئەو بەڕێزە هەستاو منیش لەبەر پێی پیرۆزی ئەو زاتەدا، ڕاکشامو سەرم کردە سەر زەویو خەوتم. کاتێ بەناکا هاتمەوە، هەستم کرد شەیتانی بووم، سەرگەردان بوومو پەشۆکام، تاوێک بەملاو لادا هەڵخولام. کابرای نووستووم خەبەر نەکردەوەو چوار پێنج جار لە ڕەشماڵەکە هاتمە دەر. بۆ غوسلکردن چوومەوە چاوکەکەی نزیک ڕەشماڵەکەو بە هۆی سەرماو ساردیی زۆری ئاوەکەو ئەو کزەبایەی کە خەڵکی شەمزینان پێی دەڵێن: هورە توانای غوسڵم لە خۆمدا شک نەدەبرد، دیسانەوە بۆ ناو چادرەکە هەڵدەهاتمەوە. ناچار لە شەرمی ئەوەی نەوەکو ئەو زاتە خەبەری بێتەوەو بەم حاڵەوە بمبینێ. دەستم لە گیانی خۆم هەڵگرتو بەو تاریکە شەوە، چوومە کوێ کانیەکە، هەتا جلەکانم داکەندن، لەوانە بوو لە بەر تەوژمی سەرماو زەبەندی باکەدا، زمانم لاڵو قاچم لە کۆ بکەوێت. هەرچۆنێک بێت چوومە ناو ئاوەکەوەو لەش پیسم لە خۆم دەرکرد. کاتێ بە ددانە چوقە. لە ئاوەکە هاتمە دەرێ. جلەکانم. با هەر پارچەیەی بە لایەکدا ڕفاندبوو. هەریەکەی بە لقە دارێکو بن دەوەنێکەوە گیرسابوونەوە. بەو حاڵەوە بە ڕووتو قوتی، لەملا بۆ ئەولا، بە دوای جلەکانمدا ڕامدەکرد، هەتا دۆزیمنەوە، زۆری پێ چوو، هەموو گیانم دەتووت شەپڵە لێی داوە. لە دڵی خۆمدا وتم: ئەگەر ئێستا ئەو زاتە، خەبەری ببوایەتەوەو بەزەیی پێمدا بهاتایەو بەو سەیدەی بفەرمووایە: ئادەی ئاگرێک بکەرەوە، چ دەبوو، کتوپڕ دەنگی ئەو زاتەم بەر گوێ کەوت. کە بەو سەیدەی فەرمووو: خێرا ئاگرێک بکەرەوە، میرزا خەریکە لە سەرمادا ڕەق دەبێتەوە. چورایندەی "١٥٢":

ئەو بە چاکەو ئەوەی مەلایکەت، پڕ سیوبە دەردەم
واتە: وەفایی لە بیرم ئەچوویت. هەر وایت لە یادم
وتم: لە تاوی ئێسرکزی تۆ بوو. ئەخوش کەوتبووم
هەر پەرچەمی تووبەسێی تۆش، تۆشی لەرزو تای کردم

پاشان هەتا یەکەیەکی جلەکانم هەریەکە لە شوێنێک دۆزییەوەو لە بەرم کردن، نیوە گیان بوومو دەستو زمانم لە کۆ چوونو وەکو پیاوی سەرخۆش و کێژ، بە لارە لارو کێرە کێر، بەرەو چادرەکە بوومەوەو لە نزیک ئاگرەکە ڕۆنیشتم، ئەو زاتە لە ڕووی بەزەییەوە بە تووڕەییەوە فەرمووی: خۆ چێشتخانەمان هەیە. ئاوو ئاگر، نۆکەرو بەردەستیشی لێیە، بۆچی خۆت لەو ئاوە ساردە هەڵکێشاوە؟ عەرزم کرد: تەرەو شکۆە نەیهێشت پاشان پۆستینەکە پیرۆزەکەی پێدا دام. هەرچەند لە ئاگرەکەش نزیک دەبوومەوە، تەوژمی سەرماکە. لە دڵو گیانم دەرنەچوو. ددانەکانیشم لەبەر لەرزوتا. نەدەهاتنەوە یەک.

ئەو زاتە فەرمووی: ئەم سەرمایە، بەم ئاگرە لە گیانی تۆ دەرناچێت. وەرە لای خۆمەوە، چوومە لایەوەو لە بەردەم ئەو زاتەدا لەسەر ئەژنۆ دانیشتم. چوارینەی "١٥٣":

ئەوشۆخەی نازی لە سەرووتری مانگی تابان کرد
ماوەیەک لە لای وەفایی گیر بوو. ڕووی خۆی پەنهان کرد
ڕووی خۆی دەرخستو بە تیلەی چاوێک لە ناوی بردم
هەر خۆیشی دەردی هەزار ساڵەی چارەو دەرمان کرد

تاوێک لەو دۆخەی من ڕاماو ئەوەندەی ئەخایەند، کە لە تەوقی سەرمەوە، تا نووکی پێم، لە ئارەقدا شەلاڵ بوونو هیچ دەمارو پێستو ئەندامی دەرو دەروونم نەما، لەم گەرمییەدا نوقم نەبێتو نەبرژێت. ئیتر ناسوودە بووم، دیسانەوە کەوتەوە سەر گۆنەکردنم، کە چێشتخانە هەمیشە ناوی گەرمیی لێیەو تۆ هەتا کەنگێ نامۆیی دەکەیت!؟ جارێکی تر بەم کارانەت ڕازی نابم. چوارینەی "١٥٤":

خۆزگەم بەو کەسەی گفتــو شکەکەتو ماندووە گیانی
یارێکی هەیە. ڕووی مانگو چارساز. بە میهرەبانی
وەفایی. جارجار بە ناز هەنگاوێک لەبەر خۆی دەنێ
دەردی بێ دەرمان، زامی نادیار، دەکات دەرمانی

هاوینێکی تریش دیسان ئەو زاتە، ڕووی کردەوە هاوینە هەواری مەیدانانو خەریکی ساز کردنەوەی ئاوەدانیو دروستکردنەوەی ماڵی چەند تیوە کارێکی بوو. ڕۆژێکیان سەعید خان بەگی حاکمی شەمزینان هاتە زیارەتی ئەو زاتە، چەند ڕۆژێک لەوە پێش- باش لەسەر هۆش نیم-نازانم جوانوە ئەسپ بوو، یان ماییێن، بە هەشتا تمەن کڕیبوویو لەگەڵ خۆی هێنا بووی، شەوێکیان وڵاخەکەی تووشی دەردی سندان بوو، ئەو بەسزمانە هەتا ڕۆژ بووەوە، خۆی بە زەویدا دەداو هەڵدەستایەوە. ئارامی لێ بڕابوو. ئەو زاتە تەشریفی بۆ مزگەوت بردو دوای بە جێهێنانی نوێژ، دەستی بە خەتمو تەوەجوە کردن کرد. منیش لەناو ئەڵقەکە هاتمە دەرێ، سەیرم کرد وڵاخەکە درێژ بووەو چوار پەلی ڕاکێشاوەو بە چاوی ئەبڵەق بوویەوە. سەر لە زەوی دەکوتێ، بێ دەستو پێ لە بیری مردندا بوو. سەعید خانیش لەگەڵ کۆمەڵێ نۆکەرو دەستو پێوەندداء بە چواردەوری وڵاخەکەدا دۆش دامابوونو ڕاوەستا بوون. فرمێسکی داخو پەژارە، لە چاویان دادەوەرىو بە خەمێکی زۆرەوە چاوی لە ئەسپەکە بڕیبوو، بەرە دەستی، لە یەکتر هەڵدەسوون. چوارینەی "١٥٥":

ئەگەر دەتەوێ گیانت بە هیچ جۆر، زیان نەکات پێی
هەر لە خۆتەوە دڵبەستە مەبە لە هیچ ئەڵێی
وەفایی. هەموو شتێکی دنیا، شتێک ناهێنێ
جگە لە یارێک. دڵناواڵا بێ و دڵنیا بیست لێی

نۆکەرەکان هەرچی سەرو پێی وڵاخەکەیان دەبزواند، هیچ بزوتنەوەیەکی تێدا نەما بوو. ئیتر بە تەواوی دەستیان لە زیندوبوونەوەی شتو نائومێد بوون. من پێم وابوو دوای دوو-سێ دەقیقەی تر. هەناسەی تێدا نامێنێ. کەچی لەم کاتەدا، ئەو زاتە کە لە خەتمو تەوەجوە کردن تەواو ببوو، هاتو بە سەعید خان بەگی فەرموو: ئەوە بۆ وڵاخێک دەگریت؟ عەرزی کرد: لە دەورت کەڕێم، هەشتا تمەنم پێ داوە. هەشتا تمەن کەم نییە. سەرەڕای ئەوەش وڵاخی وام بە گران دەست دەکەوێتەوە. ئەو زاتە بە کەشمو ئەشم بەرەو لای وڵاخەکە چوو. گۆچانی موبارەکی لە حاند سەریەوە، تا کلکی پێدا گێڕاو فەرمووی: هەستە هەستە. ئەو بەسزمانە دەستبەجێ سەری بەرز کردەوەو تاوێک لە ڕوخساری ئەو زاتەی ڕوانی. وەک کەسێکی سەرە ملی وڵاخی مردو، بە گورمەوە بە زەویدا بدات. ئاوا سەرو ملی کەوتە سەر زەوی دیسانەوە وەک جاری پێشوو، ئەو زاتە گۆچانی موبارەکی بە سەرو ملیدا هێناو فەرمووی: هەستە هەستە. دیسان سەری بەرز کردەوەو تاوێک لە ڕوخساری پیرۆزی ڕوانیو سەری داکەوتەوە. ئەو زاتە، بۆ جاری سێیەم، گۆچانی موبارەکی بە سەرو ملیدا هێناو بە دەنگی بەرزو توڕەییەوە فەرمووی: هەستە هەستە. ئەم جارەیان وەک ئەوەی سەد کەس بە یەکەوە بە یەک گوژم، لە سەر زەوی هەڵی بکرن، ئاوا ڕاست بۆوەو هێزو جوڵەی بە بەردا هاتەوە. چوارینەی "١٥٦":

وەفایی. وەها چاک بیبێتە خاوەن دڵ و گیان
گیانبازیی بکەو ببە بە سەرکەرد پێناوی ڕەندان
ڕەندان هەر کاتێ سەرنج لە حاڵی ئاژەڵێک بدەن
گیانی تێ دێتــو دڵ پەیدا دەکاو دەبێتە نیشان

قریوە لە خەڵکەکە هەستاو هاواڕو خرۆش کەوتە ناو خەڵکو وڵاخەکەش زرپو زیندوو ڕاست بووەوە. سەعید خانی بەگی ناوبراو، کە پێشتر زۆر نکوڵی دەکرد، خێرا بڕوای هێناو چەند سەر مەڕێکی بە فەقێکانی ئەوێ بەخشیو هەتا لە ژیانیشدا بوو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە ئەمەکترو هەمیشەش خەریکی خواپەرستی بوو. چوارینەی "١٥٧":

خوایە هیچ کەسێ بە سەرێ نەیەت وێنەی وەفایی
ئەفەس مردووەو لە هیچ کەس ناچێ بە بەروڵایی
بۆ ئەوەی توانای پووچو ڕزیوی زیندوو بێتەوە
خوایە گیان هەر خۆت بکەیتە لای: ئەفەس عیسایی

ساڵێکی تر. لە وەرزی پاییزدا. ئەو زاتە لە گوندێکی بە زێر کراوی خۆیدا مابووە. کرێکارێکی زۆریش خەریکی سازکردنەوەی چەند ماڵێکی ئاوایی بوون. کۆمەڵێک وەستاو کرێکاری تریش لە لایەکی تردوە خەریکی ڕووخاندنی کۆنە قەڵاو باڵەخانەیەک بوون. دانیشتوانی ناو چیا لەبەر ئەوەی خێڵەکینو وەک شارستانی شارەزاو بە ئەزموون نین. لایەکی کۆشکەکەیان ڕووخاندبوو. دوو لای تریشی، کە نزیکەی "٣ گەز" دەبوو، ڕماندبوویان. نزیکەی نیوەی سەربانی کۆشکەکەش، کە هەموو بەردی تاشراوو ئەستور بوو، بە حەواوە مابووەوە. هێندە کەوچو کەم ئاوەز بوون، نەیاندەزانی ئەمجۆرە ڕووخاندنە، مەترسیی دواوەیەو دەبێتە هۆی داتەپینی سەربانەکە. چوارینەی "١٥٨":

لە ناو لاوێدا هیچی تیا نییە. جگە داناویی
عومری شیرینی خۆت لە کیس مەدە. بڕوا خۆرایی
وەفایی گوایە. پێغەمبەری خوا. ئاوای فەرمووە:
ببە بە شاریی. لەوێ خودا. دین و دنیای پێداوێ

کرێکارەکانیش هەروا خەریکی ڕووخاندنی پاشماوەی کۆشکەکە بوون. لەو کاتەدا من هاوارم لێ هەستاو چوومە خزمەت ئەو زاتە. عەرزم کرد: قوربان ئەم خەڵکە زۆر گەوجن. بنمیچی کۆشکەکە خەریکە دەڕووخێ‌و لەوانەشە کرێکارەکان بین بە ژێریەوە و تێدا بچن. ئەو زاتە بەرەو لای کرێکارەکان بەڕێ کەوت. کە نزیکەی دووسەد کەس دەبوون. لە دوای دوو – سێ دەقیقە هاواری لێ کردن. ڕاکەن، دوور کەونەوە. لە پڕ بنمیچەکە داڕووخاو بە ئەندازەی گردێک. تەپ‌و تۆز بڵند بووەوە‌و ئەو دەوروبەرەی داپۆشی. هەر کەسەو بە پرتاو بە لایەکدا هەڵاتبوو. لە دوای ماوەیەک، کە تەپ‌و تۆزەکە نیشتەوە، بۆیان دەرکەوت کرێکارێکی مێردمنداڵی سیازدە ساڵەی کەچەڵ، بووە بەژێر ئەو گڵ‌و بەردو دارەوە. چوارینەی "١٥٩":

بانگە بەسەر مێرمناڵێکدا هەرەسی هێنا
کەس‌و کارەکەی بە گریانەوە، جەرگیان پڕ خوێنە
دوای یەک دوو سەعات، کە دەریان هێنا
کوتی: وەفایی بچۆ فاتیحەی لەسەر بخوێنە

ئەو تەلە بەردانە، بەلای کەمەوە هەزار دانە دەبوون. ئەوەندەی کەزێکیش کڵ لە سەربانەکە بوو کرێکارەکان کۆ بوونەوەو نزیکەی نیو سەعات، بە پاچ‌و پێمەڕە، کڵ‌و بەردیان دەبژاردو دوور دەخستەوە، لە دواییدا لاقێکی کوڕەکە دەرکەوت‌و بە تەقەللایەکی زۆر، کوڕەیان لە ژێر بەردو کڵ هێنایە دەرێ. بەڵام هیچ جووڵەو بزوتنێک لە لەش‌و دڵی نەدەهات. هەمووشیان گومانیان نەمابوو، کە مردوە. زۆر سەیر بوو، ماوەی سەعاتێک لە ژێر ئەو هەموو گڵ‌و بەردەدا بمێنێتەوەو هەموو لەشی ونجر ونجر نەبێت‌و نەبێتە خۆڵ‌و خاک! دوو–سێ کرێکاری خزمی کوڕە دەستیان کرد بە شین‌و ڕۆ ڕۆ. ئەو زاتەش فەرمووی: مەگرین ئەگەر خوا پێی خۆش بێت، زیندو دەبێتەوە. بە فەرمانی ئەو زاتە، کوڕەیان بە چوار دەستان هەڵگرت‌و لە شوێنێکی دیاریکراو دایان ناو خەڵکەکە خڕ بوونەوە، ئەو زاتە، چارەکە سەعاتێک لە ژوور سەری وەستاو لێی ڕاما. کت‌وپڕ کوڕە جوڵایەوەو هەستایە سەر پێ. بە یەک جار وەک قیامەت ڕاسابێ، قریوەی شادی‌و جەزمە، کەوتە ناو خەڵکەکە. چوارینەی "١٦٠":

خێرا ئەو قوتبی زەمانە، بە ناز تەشریفی هێنا
فووی بە سەردا کرد، کوڕە لە جێی خۆی ڕاست بۆوە. هەڵسا
کاتێ کوڕەکە، کەوتە جووڵان‌و سەری هەڵبڕی
هاوارو جەزمە، بڵاو بوو لە ناو پیرو لاوانا

ئەوسا ئەو زاتە فەرمووی: کەمێک هەنگوین لە ماڵی ئێمە بهێنن، بیدەنێ‌و برێکیشی لە سەری هەڵسوون. ئیتر تەشریفی بۆ حەرەم بردەوە..... زۆر بە وردی سەیری هەموو گیانی کوڕەکەیان کرد، ساغ‌و سەلامەت بوو. بەڵام بەو هۆیەوە کە تووک بە سەرییەوە نەبوو. خوێنی لێهاتبوو.. دوبارە خەڵکەکە دەستیان بە کار کردەوە. چوارینەی "١٦١":

نازەنینێک وای بە وەفایی وت، لەبەر بەیانا
چارەی دەست نەکەوت، لای هیچ پزیشک‌و ناو حەکیمانا
لەو دوو نێرگزە دڵڕفێنەوە، لە ڕووی لوتفەوە
تیلەی چاوێکت بەسەو بۆ هەموو دەرادێک، دەرمانە

ساڵێکیشیان پێشەوای ئەرمەنییەکانی ناوچەو دەوروبەری شاری وان، کە پێی دەوترێ: مارشەمون‌و بە واتای ئەرمەنییەکان بەو کەسانە دەڵێن: پێشەوا، کە ئەرکی دنیایی کردبێ بە سەرۆکی کۆمەڵێ ئەرمەنی بێت‌و لە ئایینی خۆیاندا بە گەورەو ڕێنوێن‌و جێنشینی حەزرەتی عیسا"د. خ"ی دەدەنێن، ئەم مارشەمونە. لەناو پەیڕەوانی خۆیاندا، هێندە جێی برواو متمانە بوو، کە لە کاتی دەست شتندا، ئەیاندەهێشت ئاوەکە بڕژێتە سەر زەوی، بەڵکو ئاوەکەیان بە تەبەڕوک. شار بە شارو وڵات بە وڵات دەبردو دەیانخواردەوەو لە خواردن‌و خواردنەوەکانیان دەکرد. چوارینەی "١٦٢":

بە پێی ئایینی مەسیح، مارشەمعون ڕابەرو پێشەوە
واتە: خەلیفەی مەسیحیان‌و سەرۆک‌و مێشە
خۆڵی بەری پێی لایان پیرۆزەو بە موفەڕەک ئەدەن
هەرکەس بە دینی خۆی دڵبەستەیەو شادو دڵگیرە

سەرەڕای ئەوەش کە کوێرایەڵی دەوڵەتی دەکرد، بەڵام زۆربەی ساڵەکان تا فەرمانی دەکردو بەڕاتی دیاری کراوی نەدەدا. حکومەتیش کەمێک چاوپۆشی لێ دەکردو. زۆر بە کەمی سزا دەدرا. سەرەنجام بەهۆی زاتی کلاوی‌و کینەو دوژمنایەتی ئایینەوە لە تەک دەست‌و پێوەندەکانیدا هەموو چەکدار بوون‌و بۆ شەڕ لەگەڵ ئەو زاتەدا ئامادە بوون. هەتا دەڤەری وانیش کە خاکی عوسمانییە. هاتنە پێشەوە. لەوێوە هەواڵیان بۆ ئەو زاتە نارد کە خۆی ئامادە بکات‌و دەبێ تا سەرلەبەری شەمزینان تەفرو تونا نەکەین، خەو و خۆراکم لێ حەرامە... پاش چەند ڕۆژێک بەم لەشکرەوە لە وڵاتی "وان"ەوە تا ناوچەی "گەڤەر"، کە دوو قۆناغە ڕێ لە نەهرییەوە دوورە، نزیک بوونەوە. لەملاشەوە جەماوەرو نزیکان، هەموو ڕۆژێک‌و هەموو سەعاتێک، دەستە دەستە دەهاتن‌و دەچوون‌و شاڵاوی ئەرمەنی دەناڵۆزان‌و دەپەشۆکان. ئەو زاتەش بەردەوام دەیفەرموو: بەبێ فەرمانی حکومەت، پێویست بە کۆکردنەوەی خەڵک ناکات و بڕۆن لە ماڵی خۆتان ئاسوودە دانیشن، خوا گەورەیە.

ڕۆژێکیان ئەو زاتە، مەلا ئەحمەدی کاتوونەیی خواست‌و بە نوێنەرایەتی‌و پەیامنێری خۆی، بۆ لای مارشەمونی هەڵبژاردو ئەویش پێی فەرموو:

من بەم بێ دەم‌و بێ زمانییەو مارشەمونیش بەم هەموو بێدینی و زمان پاراوییەی کە لەناو جەماوەری ئەرمەنیدا سەیرو سەمەرەیەکی هەڵکەوتەیە، چۆن دەتوانم گفتوگۆی لەگەڵدا بکەم! چوونی من دەبێتە هۆی زیانێکی زۆرو کوتوبێژی من لەگەڵ ئەودا دەبێتە مایەی زیان‌و دەرکەوتنی سەرشۆڕی کەلەکەمان. ئەو زاتە پێی فەرموو: دەبێ بچیت‌و هیچ ترس‌و بیمێکیشت نەبێ، چونکە ئەولیبای مەزن ڕەشیدن.

ئەو بەڕێزەش بە پێی فەرمانی ئەو زاتە، خۆی تەیار کردو لەگەڵ دووسێ نۆکەردا مۆڵەتیان خواستو چوونە ناوچەی گەڤەرو بە مارشەموون ڕادەگەیەنن کە لەلایەن ئەو زاتەوە پەیامنێرێک هەواڵی هێناوە، ئەویش دەڵێت ئەمڕۆ ناکرێت، با شەو بێت. ئەو بەڕێزەش دوای نوێژی نوستنان دەچێتە لای مارشەمونو تاوێک دەئاخێونو لە دواییدا دەڵێ: من دەست هەڵناگرم، چەند سوێندی وام خواردووەو نەزری وام کردووە، بە لایەنگیری و پێداگیری ئایینی خۆم، لە ڕێگەی حەزرەتی مەسیح، یان سەری خۆم دادەنێم، یان دەبێت خاکی شەمزینان بە تووڕەکە بپێژم.
ئەو بەڕێزە بە نائومێدی هەستاو بۆماڵی خۆی هاتەوە. بە پەلە پیاوێکی گورج و سوکەڵەی بە نامەوە نارده خزمەت ئەو زاتە. کە ڕابگەیەنێت ئەم تۆفانە، بە جۆرێکی وا نەوروژاوەو ئەم ملهوڕە بە چەشنێک ئاور ناپرژێنێ تا چارەسەر بکرێ. یان دەبێت بۆ شەڕ تەیار بین، یان دەبێ شەمزینان جێ بهێڵین. ئەو زاتە دەستبەجێ وەڵامی بۆ نوسییەوە: مەترسەو ئەم شەوی داهاتووش بچۆرەوە بۆ لای مارشەمون، چونکە ئەو بێ پشت و پەنایە حسابی بۆ کرا. چوارینەی (١٦٣).

ئەو قوتبی دەهرەی لە گشت دنیادا تاکو تەنیایە
نامەی لەو جۆرەی بە تەتەریا نارد مزگێنی تیایە
لەناو جیهانی غەریبەوە پشتی دوژمنان شکا
تیری پیاو چاکان بەری کەوتووە والە چاویایە

ئیتر هیچ پێویست بە هێز کۆکردنەوەو شەڕ ناکات. هەر ئەو شەوە مارشەمون جەنابی مەلا ئەحمەد دەخوازێو ئەمجارەیان بیروڕاو ئاخاوتنی لەگەڵدا دەکاتو دەڵێ: من لەو کارەی کردوومە، زۆر پەشیمان بوومەتەوەو ئێستاش خۆم بە دۆستو ئاشنای شێخ دەزانمو ئێمە هەردوکمان دەروێشین، ئایینی هەردووکیشمان دەستبەرداربوونی ئارەزووە، نەک بیرکردنەوە لە خەیاڵاتی چەپەڵو دروستکردنی نەفسی پڕوپووچ و شەیتانی. بۆچی بە فڕوفێل و هەوای کۆمەڵێک نەزان ببینە هۆی خوێنڕشتنی کۆمەڵێکی زۆر لە هەردوو لاو ببینە مایەی هەڵگیرساندنی شەڕو ئاژاوەو ڕق و کینەی کردگار؟ چوارینەی (١٦٤).

بە هیمەتی ئەو چرای ئیسلامەی پەنای تەواوە
چۆن شەولە ترسی تیشکی مانگ شەو دەکشێتە دواوە
ڕێبەری هەموو ڕێ ون کردوانیش، بە ڕێگەی خۆیدا
بەخت و ڕووی ڕەش بوو، لە کوێوە هاتبوو، هەر واگەڕاوە

هەر بەو جۆرەش عەرزی دۆستایەتی من بە شێخ بگەیەنە... خۆ ئەگەر لەبەر هەندێ کارو بار نەبوایە خۆم دەهاتمە خزمەت شێخ. ئەوسا ئیزنی گەڕانەوەی پەیامنێرەکەی دابووو خۆیشی پاش دوو سێ ڕۆژ، وەک بەختە وەرگەڕاوەکەی، بۆ وڵاتی خۆی گەڕایەوە.
دەرکەوتنی ئەم سەرکەوتنە بووە مایەی باوەڕهێنانی دۆستایەتی کردنی زۆربەی نکوڵی کاران. چوارینەی (١٦٥).

ئەو چاکەیەی وا، خواهەر بە تەنیا، لە تۆیدا خولقان
سەد وەک وەفایی، بە نازی دەستی تۆ، شەهید کران
کافر، کە زولف و پەرچەم و تاقی بڕۆی تۆی بینی
خێرا ڕووی بەرەو قیبلە وەرگێڕاو زوونناری پسان

ساڵێکیش مستەفا پاشای میر ئالآ کە لە دەڤەری قارس دادەنیشت، بە مەبەستی ئەنجامدانی کارێکی گرنگو گەورەو جێبەجێکردنی کارێکی تایبەت لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە، بە هێزێکی گەورەوە نێرران بۆ نەهری. هەرچەندە لە ڕواڵەتدا لوتف و دڵسۆزی بەرامبەر بەم باوەڕە پۆڵایینە دەنواند، بەڵام لە ئاخدا ئێجگار نکوڵی دەکردو لە دوای زیارەتی ئەو زاتە، دڵیمان بۆ دەرکەوت. پاش گەیشتنە نەهرێو تەرخانکردنی شوێنی دابەزین، بۆ خۆییو چەند پاشایەکی یاوەری، چەند سەعاتێک حەسانەوەو ئاسودە بوون. منو حاجی ئیسماعیلی نازر، بە پێی فەرمانی ئەو زاتەو بە پێی ڕەسمی دەرویشان، شەربەت و شیرینی و کولاو و قەنداومان گێڕا. کەمێکیان لێ خواردەوە. ڕەنگو ڕووی ئەو پیاوە، ڕق و ناخۆشیی لێ دەباریو بڵێسەی کینەو نکوڵیی پێوە دیار بوو. توندو ڕقاویو بێدەنگو بێ باکو ڕووترشو برۆ گرژ بوو. هەر دەتگوت سرکەفرۆشە، یان مەنجەڵی لە کوڵ و لە جۆشە. مەیل و گوێی بە کەس نەدەدا. چوارینەی (١٦٦).

ئەی دڵەی بەدخوو، داساکن بەس بێ، بەس ئەم هەڵانە
ئیتر لە دەرگەی ئەم وئەو مەدەو بڕۆ مەزرانە
وەفایی سەیری ڕوخساری دەرێ و ڕوالەت مەکە
یەک ڕەوشتی جوان، بە بارتەقای سەد ڕوخساری جوانە

ئەگەرچی پەردەداری ئەو زاتە، پیرۆزبایییو بەخێرهاتنی دەکردن. کەچی ئەو متەقی لێوە نەدەهات. لە ڕاستیشدا تازە لاوێکی بەم شەنگ و شۆخییە، کە تەمەنی "١٧–١٨" ساڵان دەبوو، لەم سەردەمەدا بینوێنە بوو. نە پیرێکی بێناو نە لاوێکی گوێڕایەڵ بوو. بە ڕوخسارو لەشو لار، باڵابەرزو بازوو ڕۆستەمانەو چاکو ئاسکو سەرومل دڵڕفێنو برۆ ئەستوورو جوامێرو زانست پەروەرو سامناک بوو. خاوەنی جوانیی گوڵ و زمانی بولبول بوو. ئەوەندە ڕۆحزل و خۆ بەزلزان بوو، نە مەیل و گوێی بە کەس دەداو نە لوتفو میهربانی لەگەڵ کەسدا دەنواند. دەتگوت دوژمنی خوێنییو خوێنخۆری دەروونییە. چوارینەی (١٦٧).

ئەی ئەوەی ڕێگا دەگرێت لە تیلەو نیگای دڵداران
بە جوانیی خۆتا مەنازێ و مەدە ڕەنجی بە تاڵان
تۆش ئەی ئاوێنە سڵ کە لە گسپەو ئاهی وەفایی
زۆر ڕەنگی سپی، گۆڕیوە بە ڕەش، ئەم سوورەی دەوران

بیرەوەرییەکانی وەفایی

[illegible]

کرد و کۆی
مامۆستا قازی محەمەد خزر

وەرگێڕانی لە فارسییەوە
محەمەد حەمە باقی

دوای سەعاتێک منو حاجی ئیسماعیلی نازر، هەستاینو هاتینە خزمەت ئەو زاتەو بە درێژی باسی ناکارو کرداری ئەو پیاوەمان بۆ کرد. ئەو زاتە هیچی نەفەرموو. چێشتەنگاوی ڕۆژی دوایی، ئەو زاتە فەرمووی: بەرماڵەکەم بۆ بهێنن و بۆم ڕابخەن. دەمەوێ ئادابی بەخێرهاتنو پیرۆزبایی چاوپێکەوتنی بکەم.

منیش بە پێی فەرمانی ئەو زاتە، بەرماڵەکەم بردو ڕامخستو پێیم ڕاگەیاندن کە ئەو زاتە، تەشریف بۆ ئێرە دێنێت. پاشان ناوبراو لە شوێنی هەمیشەی ئەو زاتە، لە نزیک پەنجەرەکەوە، بەوپەڕی فیزو کەورەییەوە دانیشتبوو. توندو بە هەیبەت خەریکی سەیرکردنی حەوزی ناو حەوشەکە بوو. چوارینەی "١٦٨":

*لە کن ئەو کەسەی خاوەن کەماڵە، گوایە وا باوە*
*چون لای دڵداران بە جوان ناسراوەو جێگەی شیاوە*
*بە خۆی دەنازێ، وەفایی بەڵام، ئاگای لێ نییە*
*کە چەرخی گەردوون، چی لە هەناوی خۆیدا داناوە*

کتوپڕ ئەو زاتە تەشریفی هێناو منیش پەردەکەم لابرد. هەموو پاشایانو عوسمان ئەفەندی، کە وەرگێڕو کاتبی "وان" بوو، هەستانو پێشوازیان کردو دەستی موبارەکیان زیارەت کرد. چوارینەی "١٦٩":

*ماری پەرچەمو زوڵفی لە سەر ڕوخساری، خست بەملاو لادا*
*ڕووی لە مانگ دەچوو، ئەو کاتەی هەڵدێ لە تاریک شەودا*
*یار هاتو دانیشت وەفایی ئیتر کۆڕی عاشقان*
*دووسەد ناڵینو شیوەنو هاوار، لە ناویان هەستا*

هەتا نەگەیشتە لای بەرماڵەکە، مستەفا پاشا هەڵنەستاو دەستی بۆ درێژ نەکرد. پاشان وەک جاری پێشوو، لە شوێنەکەی خۆی دانیشتەوەو خەریکی سەیرکردنی حەوزو حەوشەکە بۆوە ئەوەندە بێ دەربەست دانیشت. کەلەکەی ڕاستی کەوتبووە بەرامبەر ڕوخساری ئەو زاتە. کۆڕەکەش چەندان پاشاو خاوەن پایەی حکومەتی عوسمانی لێبوون. هەندێکیان لەسەر کورسی دانیشتبوونو هەندێکیشیان چۆکیان دادابووە سەرلا زەویو کڕوکپ دانیشتبوون. چوارینەی "١٧٠":

*لەناو مەڵبەندو کۆڕی عاشقی بێ ناونیشان*
*تاوێک ئارام بەو بحەسێرەوە، ئەی گیانی جیهان*
*دڵ لەسەر دەستو گیانیش لەسەر دەست، وەکو وەفایی*
*لە غەمزەکەی ئەو، ئاماژەیەکو ئینجا ش دڵو گیان*

جەنابی خەلیفە مەلا عەبدوڵای سلیمانی-ناسراو بە جۆلا-ش لە نزیک ئەو زاتەوە دانیشتبوو. منیش لە پشت سەری خەلیفەوە وەستابووم. سەری هێنایە بن گوێمو وتی: زۆر زەحمەتە ئەو زاتە، ئەو دڵە بەردو پۆڵایینەی ئەم مستەفا پاشایەی پێ نەرم بکرێتو لەم حاڵە بیکۆڕێت.

ئەو زاتە ماوەیەک لێی ڕاماو لەناکاو مستەفا پاشا وەک ئەوەی لە پڕێکدا خەنجەرێک بە کەلەکەی ڕاستیدا بکەن، یان تینی بەرکەوتبێ، خێرا ڕووی لە سەیرکردنی حەوزو حەوشەکە وەرگێڕاو لە بەردەم ئەو زاتەدا چوو بە چۆکداو سەری خەواند. ئیتر ڕوخساری نیشتە سەر عارەقو وەک شەونمی تازە بەهار، یان وەک چیمەنو چەپکە گوڵ، گوڵاوی لێ دەتکا. چوارینەی (١٧١):

*کە پیری مەزن، تیلەی پڕ سۆزو بەخشینی چاوی*
*بڕییە ئەو لاوەی خۆ بەزلزانو کەشفو فیزاوی*
*لە هەنیەیەوە، وەفایی تک تک، ئارەق دەتکا*
*وەک گوڵی بەهار، کە لێی بچۆڕێ، تکەی خوناوی*

وەک چۆن موریدو دەروێش، لە خزمەت شێخی خۆیدا، بە ئەدەبو خۆنەنوێنی چۆک دادەداتو خۆ بەکەم زانانە دادەنیشێت، ئاوا شەرمەندەو خەجاڵەتبار نوشتایەوە. چوارینەی (١٧٢):

*ئەو شەنگەی، سیمای لەوپەڕی جوانییو بێ هاوتاییە*
*سەردانەواندن، بۆ پاشایانیش، نازانێ چییە*
*کەچی تاقە سەرنجێکی پیر، واکیرۆدە بوو*
*شەکەتو زامدار، کەتەمەت دەتوت. هەر وەفاییە*

دانیشتوان کە هەرگیز چاوەنوارێ ئەمەیان لێ نەدەکرد، بە بینینی ئەم حالە، واقیان وڕماو کیژو ویژ بوون، پاشان ئەو زاتە لە جێیکەی خۆی هەستاو مستەفا پاشا کەوتە بەرپێی پیرۆزیو بە چاوی پڕ لە فرمێسکو دڵو گیانی بێ ئۆقرەو خۆ بەکەم زانینی لە ڕادە بەدەرەوە، دەستی کرد بە داوای لێبوردنو ددانی بەبێ ئەدەبیی خۆیدا هێناو داوای چاوپۆشی لەو زاتە خواست. هەتا ئەو زاتە، لە ژوورەکە چووە دەرێ، هەموو پاشاکان بەرێیان کردو بە فەرمانی ئەو زاتە، گەڕانەوە سەر شوێنی خۆیان.
دوای ئەوە مستەفا پاشا، زۆر بە جەختەوە، بە یەکێک لە نۆکەرەکانی ئەو زاتەی ئەمر کرد، کە تا من لێرەم، دەبێ تۆ پاسەوانو ئاگادار بیت، هەر کاتێک ئەو زاتە ویستی تەشریف بۆ ئێرە بهێنێت، چەند دەقیقەیەک پێش ئەوە، ئاگادارم بکەرەوە، تا بێمە پێشوازو تاوێک لەبەر دەروازەدا بوەستمو پاش زیارەتی ئەو زاتە، لە خزمەتیدا بێمە ناو ماڵ.
ئیتر هەتا مستەفا پاشا لە ئەهری میوان بوو، ئەو نۆکەرە، پاسەوانو تەرخانی ئەم کارە بوو، ئیتر ئەو بیروباوەڕە پڕووپووچەش کە لە سەریدا بوو، خستیە ئەولاوەو لەسەر دەستی پیرۆزی ئەو زاتەدا تۆبەی کرد.
مستەفا پاشا لەبەر ئەوەی پیاوێکی پاکو دەست ڕۆیشتوو بوو، بوو بە زامنی داواکارییەکانی ئەو زاتە، لای حکومەتی خاوەن شکۆو لە ڕۆژی ڕۆشتنیشدا، ئەو زاتە، بایی چوارسەد تمەن لە فەرشو کاسەو دیاری نایابو ئەسپو هێستری ئامادە کردو بە ناوی دیاری دەرویشانەوە، بۆ خۆیو پاشاکانی ناردو هەرچی تکایان لێ کرد، قبوڵی نەکرد، عەرزی کرد: ئەگەر لوتف بکەیت بۆ تەبەڕوک، تەسبیحی دەستو بەرکالەکەی جەنابت، لە جیاتی دارایی بۆ من بەسە. چوارینەی (١٧٣):



ئەو شێخە، هێندەی لە هەموو جۆرێ بەخشی بە دیاری
نزیکەی هەزار لیرەشی خستە تەک، بە ئەژماری
وەفایی هەمووی لە لاوە دڕا، کەچی ئەو تەنیا
تەسبیحی شێخ و بەرسالی وەرگرت، بۆ یادگاری

ئەو زاتە، هەردوکی پێشکەش کردو ماچی کردن‌و لە چاوی هەڵسوون، ئەویش دەستی پیرۆزی ئەو زاتەی ماچ کرد، لەو کاتەدا ئەو زاتە، مزگێنی بەرزبوونەوەی پلەوپایە و مووچەی حکوومەتی-لەپاش گەڕانەوە بۆ ئەستەمووڵ-پێ دا. دوای ئەوە مۆڵەتیان خواست‌و ڕۆیشتن.

دوای گەڕانەوەی مستەفا پاشا بۆ ئەستەمووڵ، ئەو زاتە چۆن مزگێنیی دابوویە، هەروا بە پلەو پایەی بەرزو موچەی شایان گەیشت‌و لە هەموو ڕویەکەوە خۆشەویست‌و دەست ڕۆیشتوو بوو. چوارینەی(١٧٤):

ئەی کەمەندکێشی دڵ و ئارام‌و هۆشی دڵداران
گیانی وەفایی لە دەورت گەڕێ‌و بۆت بێتە قوربان
بیم بەسەر گەرد ئەو نیگا مەست‌و خومارە، چونکە
نەمبیستووە ئاسک ببێتە شێر و ڕاو کات نێچیران

دیسان ساڵێکیان لە زستاندا ڕەمەزان بوو، من‌و قازی مەلا عوسمانی ئەهری‌و خوالێخۆشبوو محەمەد باقر کە یەکەمیان برازاو ئەوی تریشیان کوڕی ئەو زاتە، لەسەر دالانی خانوەکەی ئەو زاتەدا، لە حوجرەیەکدا دەژیاین‌و دەرسی فارسیم فێردەکردن.

شەویکیان لە کاتی پارشێودا، ئەو خواردنەی کە هەمان بوو، خواردمان‌و نییەتی ڕۆژوومان هێنا، ئەوان چوونە خانەقاو منیش بەهۆی ناسازی لەش‌و هێرشی خەوەوە، لە حوجرەکەدا مامەوەو خەوم لێ کەوت، لە خەومدا دوو جنۆکەم بینی، شاڵاویان بۆ دەهێنام. چوارینەی (١٧٥):

لە خەوما نواڕیم وا دوو جنۆکە، هاتن لە ناکاو
زۆر بە قینەوە هەڵەتیان دامێ، بە هەڵپەو پڕتاو
دامیان بە عەردا، بێ دەسەڵات‌و گزوڵ‌و داماو
لەم دوو سامناکە هاتمە لەرزین‌و دڵەتەپەو یاو

وەک چۆن سەگی دڕ، پشیلەیان بەر چنگ بکەوێت و بە ڕق و قینەوە بیگەوزێنن، ئاوا بەو جۆرە خستمیانە ژێر خۆیان، ئەوەندەیان بە زەویدا تلاندمەوە، لەوانە بوو هەناسەم بوەستێنێت‌و گیانم دەرچێت، لەو کاتەدا چەند جارێک بە دەنگی بەرز هاوارم کردو وتم: یا شێخ عوسمان، یا شێخ عوسمان، یا شێخ عوسمان فریام بکەوە، هیچ دادی نەدام‌و زیاتر ئازاریان دام. چوارینەی (١٧٦):

بە شپرزەیی کەوتمە نالین‌و ڕامان‌و سەرسام
ناچار دەخیل‌و دەستەو دامێنی لای شێخ عوسمان سام
هەرچەند هاوارو ناڵەو بانگم کرد
کەلکێکی نەبوو، دەستێکیش نەبوو، بگاتە هانام

دوای ئەوە، بە هەموو هێزمەوە هاوارم کرد، یا حەزرەتی سەید تەها، حەزرەتی سەید تەها فریام بکەوە، دەم‌و دەست لەسەرم لاچوون... غیرەتێکم هاتەوە بەرو ویستم هەڵێم، سەیرم کرد جنۆکەیەک لە دەستێکمدا بۆتە گورزو ئەوی تریشیان لە دەستەکەی ترمدا بۆتە قەڵغان، هەتا شەکەت‌و ماندو بووم، گورزو قەڵغانم بەیەکدا دان، لەم کاتەدا بیرم لە شتێکی باش دەکردەوە، کە ئەمانەی لێ فڕێ بدەم‌و هەڵێم، لەناکاو دەنگی ئەو زاتەم بەرگوێ کەوت-گیانم بە قوربانی بێت-بە دەنگی بەرز فەرمووی: میرزا مەترسە. میرزا مەترسە، هەستە وەرە بچینە خانەقا.

بە ترس‌و واق‌وڕماوییەوە ڕاپەڕیم‌و لە حوجرەکە چوومە دەر. سەیرم کرد ئەو زاتە لەبەر دەرگای حوجرەدا وەستاوە. فەرمووی: میرزا تۆ لێرەیت، کارت بە شێخ عوسمان چییە؟ چوارینەی (١٧٧):

کەچی لەناکاو بانگی لێ کردم، قوتبی زەمانە
وتی: وەفایی بەسیە ئەم هەموو بانگ‌و تاڵە
تۆ، خۆت کە لێرەیت، ئیتر چیت داوە لە شێخێکی تر!
خێرا کە، وەرە، ترسێکت نەبێ لە دەست ئەوانە

ئیتر لە خزمەت ئەو زاتەدا چوومە خانەقا. ئەم ڕووداوە لە ساڵی یەکەمی خزمەتەکەی مندا ڕووی دا، لەوەو پێش هۆگری بنەماڵەی شێخ عوسمان "قدس سره" بووم.

دوای دیتنی ئەم سەمەرەیە، لەو زاتە (گیانم بە قوربانی بێت) بێ ئەوەی دەسەڵات لە دەست خۆما بێت، خۆشەویستی پێشووم نەماو سەودای عیشق‌و ئەڤینی ئەم دەروازە موبارەکە بووم. چوارینەی (١٧٨):

وەفایی، هیچ کەس نییە وەکو تۆ، وێڵ‌و ئاوارە
سەرسام‌و داماو، شپرزەو ئاڵۆز، هەناسەت سوارە
ئەی غەوسی زەمان ئەی قوتبی هەرچی قوتبی دنیایە
لە دەست ئەم دێوە ڕەشەی دەروونم، داد‌و هاوارە

لە ناو چیاو نزیک بە دەڤەری کەڤەر-یش کێوێکی بەرز هەیە، شوێنی زیارەتەو بە شەهیدانیەناوبانگە. واتە(١٨) کەس لە یاران‌و یاوەرانی پێغەمبەر (د.خ)، لە سەر ئەو کێوە نێژراوە، ئەو شوێنە، شوێنێکی دڵخۆش‌و دڵگیرو مێرگ‌و زەنویرێکی زۆر بژوێنە. ئەولیاکانی پێشوو (قدس الله اسرارهم)، هەمیشە بۆ زیارەتی ئەم (شەهیدان)ە چوون‌و پیرۆزی‌و ڕاستی‌و ئەم شوێنەیان سەلماندوە. چوارینەی (١٧٩):

ئەوانەی لە دڵ، تۆوی ئەمەک‌و وەفایان وەشان
بەریان چنیوەو پڕیان کردوە عەمباری دڵیان
وەفایی، چونکە بەهۆی رووناکی خواوە دەنوارن
بێ دیدەی هەقیش، سەرنجیان لە هیچ نەداوە کێشیان

ئەو کەسەی دڵی لە ژەنگ‌وژار پاک بووبێتەوە، شەهیدەکانی بە چاوی دڵ‌و ویژدانی مینۆکی دیوەو دەبینێ. بە رادەیەک هەوای سەر ئەو کێوە ساردە، مەگەر لە چلەی هاویندا، ئەگینا کەس خۆی لەوێ ناگرێ‌و ناتوانێ بچێتە سەر ئەو کێوە.

ساڵێکیان لە ناوەڕاستی هاویندا، ئەو زاتە، لەگەڵ جەماوەرێکی چوارسەد-پێنجسەد کەسیدا، کە بریتی بوون لە ئەولیاو گەورەپیاوو مورید‌و خەلیفەو کەس‌و کارەکانی، بۆ زیارەتی شەهیدان کەوتنە رێ. چوارینەی (١٨٠):

بە جۆرێکی وا سەرنج لە تیشک‌و نوری خوا دەکەن
لە جێی خۆیاندان، کەچی وەک ئەوەی لە ئاسمان بفڕن
ئەوانەی هۆشیان بەلای خواوەیە‌و لێی ئاگادارن
بە جێ لێی دوورن، کەچی وەکی تر، لێی نزیکترن

لە بەهارەوە تا سەرەتای پاییز، دەربەندو بناری ئەو کوێستانە، قۆناغ‌و هەواری عەشیرەتی هەرکییە. ئەم خێڵە، لەو دەوروبەرە مەڕو ماڵات بۆ لەوەڕ بەرەڵا دەکەن‌و خۆیشیان لەناو رەشماڵ‌و ماڵەکانیاندا، هەتا خۆر بە ئەندازەی "یەک گەز" بەرز دەبێتە، ئاگرێکی گەورە دەکەنەوەو بەم جۆرە رایدەبوێرن.

ئەو زاتە، بە رێکەوت لە قرچەی نیوەڕۆدا، رێی کەوتە رەشماڵی سەرۆکێکی ئەو خێڵە. کە سێ چوار ساڵ لەوەوبەر "٣٠٠" سەر مەڕی ناو چیایان دزیبوو و بە تاڵانیان بردبوو. ئەو زاتە، زۆر جاری تر بە نامەو بە دەمیی لێی راسپاردبوو، کە ئەو مەڕو ماڵاتە، بۆ دەستکورت‌و خەڵکی ناو چێ بنێرنەوە، بەڵام لەبەر لوتبەرزی‌و خۆ بەزل زانین، گوێیان نەدابوویەو هەرجارەی بە بەهانەو بیانوویەکەوە، بەسەرێ گێڕابوو.

لەم کاتەدا هەر کە هەواڵی هاتنی شێخ‌و ئەم جەماوەرەیان بۆ هەوارەکەیان بیستبوو، ئاغاو سەرۆکەکانی هەرکی، هەر یەکەیان بەدەست‌و پێوەندەکانیانەوە بۆ دەرخستنی دۆستایەتیی سەرزارەکی، هاتنە پێشوازو میوانداریی گەرم‌و گوڕیان کردو ئەو زاتەش لە رەشماڵ‌و ماڵی ئەواندا دابەزی. چوارینەی(١٨١):

کە ئەو قیبلەیە نیازی سەفەرێک بوو بە مەبەستی
خەڵکی بۆ تەواف، بەسەرو بە پێ، هاتنە زیارەتی

---

چەند رەشماڵێکی تایبەتیان بۆ جەماوەر هەڵداو و دوای نوێژی نیوەڕۆ، ئەو زاتە، یەکێک لە سەرۆکەکانی خواست‌و داوای ماڵاتە تاڵانییەکەی لێ کردن. لە وەڵامدا وتی: لەو ساڵەوە کە ئەم مەڕو ماڵاتەمان هێناوەو بەشمان کردوە، زۆری بە سەردا تێپەڕیوەو شتێکی وایان نەماوە. بڕێکیان مردار بوونەتەوەو بڕێکیشی گورگ خواردوونی و زۆربەیان لەناو چوون. ئەو زاتەش لەسەر گێڕانەوەی مەڕوماڵاتەکە، پێی داگرت و سوور بوو. چوارینەی "١٨٢"

فەرموویان هەرچی ئەوەی براوە، یان لێی خوراوە
ماڵی هەژارەو دەبێ هەر هەمووی بەرێتە دواوە
وەفایی، گشتیان لە ترسا ماڵیان کەچ و داماو بوو
بەڵام کردەوە خراپەکانیان، بیر ئەهێناوە

ئاغای ناوبراو، بە فرەوێژیی و درێژدادڕیی، "شێخ"ی رەنجاند و بە تووڕەیی و تۆرانەوە هەستاو فەرمووی: ئەسپەکەم بۆ بێنن، با بڕۆین. هەرکییەکان نان و خۆراکیان ساز کردبوو. کە سەیریان کرد ئەو زاتە، لێیان رەنجاوەو سواری ئەسپەکەی بووە و خەریکە دەڕوات، بە هەزار تکا و پاڕانەوە و لاڵانەوە، هەوساری ئەسپەکەیان گرت‌و بەڵێنیان پێ دا بۆ ئەو شەوە، بۆ ئەوەی ئەو زاتە بە رەنجاوی نەڕوات - کە دەمەو عەسرێکی درەنگ بوو - لەلایەکی تریشەوە ئەم دڵگرانیی‌و رەنجانەی شێخ، بۆ ئەوان دەبووە لەکەیەکی لەرادەبەدەر - لە ناویاندا بمێنێتەوە و لەوێ رۆژ بکاتەوە، هەموو مەڕ و ماڵاتەکەی بۆ خڕ دەکەنەوە و یەکە یەکەی دەدەنەوە. چوارینەی ١٨٣:

ئامان وەفایی، هۆشت بە خۆت بێت، دڵت جلەو کە
ئەوەک کار لەسەر دڵی رەنجاندنی پیری پەیرەو کا
هەر ئا ئەو شێخەی دەتوانێ دڵت نەرم و سپی کا
دیسان دەشتوانێ هەمان دڵ، رەش و رەق و دزێو کا

ئەو زاتە بۆ دەستەبەرکردنی کارەکە، دیسانەوە دابەزی و چووەوە ناو رەشماڵەکەو نانەکەشیانی نەخوارد. بە هەر شێوەیەک بوو ئەو شەوەی رابواردو بەیانی دوای بەجێهێنانی نوێژ، هەرکییەکانی گاز کرد. چەند سەرۆکێکیان سوێندی زۆر گەورەو نێجکارییان خوارد، هەتا ئەو زاتە لە زیارەت دەگەڕێتەوە، هەموو مەڕو ماڵاتەکە خڕ دەکەنەوە و دەیدەنەوە دەست ئەو زاتە. چوارینەی ١٨٤:

مامە، ئەو کاتەی لە خزمەتی ئەو هەقخوازانە بیت
ئەگەر راست بڕۆیت، ئەوا تۆش بە رێی راستا رۆیشتوویت
لاڕێ بێ کەڵکە، وەفایی ئەگەی بیکریتە بەر
کەی لە بەرهەم و بەری درک و داڵ، یاسەمن دەچنیت!؟

ئەو زاتە لەگەڵ هەموو بەرێزاندا سوار بووەو بەرەو شەهیدان بوونەوە. کە گەیشتنە سەر کێوەکە، دەمەو عەسر بوو. لە دوای نوێژی عەسر، لە دەوری گۆڕی ئەسحابەکان - خوالێیان رازی بێت - زۆر بە رێز و حورمەتەوە، کۆ بوونەوە. ئەو زاتە و هەندێک لە خاسان، بەوپەڕی ئەدەب و رێزەوە نەژنۆیان لەسەر زەوی داناو تا دەمەو زەردەپەڕی ئێوارە، سەریان دانەواندو خەریکی دوعاکردن بوون. دوای نوێژی شەوانیش سەعاتێک بەمجۆرە داوای چاکەیان دەکرد. کۆبوونەوەو خەوتن. من و سەید عەبدولڕەحمان - یش لە خزمەت ئەو زاتەدا لە ناو



چەقی کەڵەکە بەردێکدا، کە وەک حەشارکەیەکی بەرز ساز کرابوو، ئاگرێکی گەورەمان کردەوە.
ئەو زاتە نووستو نیوەی پۆستینە پیرۆزەکەی بە مندا دا و نیوەیشی بۆ خۆی.

هەتا ڕۆژ بووە لە سەرما پارێزراین. سبەینێ دوای نوێژی بەیانی، دیسانەوە ئەو زاتە، هەتا خۆرکەوتن، بەرامبەر بەو گۆڕە پیرۆزانە دانیشت. چوارینەی ١٨٥:

ئاڵەو ڕابەردێ. ڕێبەرەو دەباتە گوڵنجاری ژووران
ڕووکەی ئاواتی وەفایە بۆ: مانگان و ساڵان
ئاکاری جوانی لەلای یارانی پێغەمبەر دەگرت
خۆی مانگ بوو. داوای لە هەتاو دەکرد، تا خۆی بکات جوان

بڕێک لە خەڵکەکەش لە دوورو نزیکمانەوە، سەریان دانەواندبوو. دوای خۆر گەرم بوون، ئەو زاتە هەستاو ماڵئاوایی کردو بە پێ‌و بە کاوەخۆ، ڕووی کردە دامێنی کێوەکەو بەرێزانیش لە خزمەتیدا داگەڕان. دیسانەوە هەر لە نیودڕۆدا گەیشتنەوە هەواری ئاوبراوی هەرکی‌و دانەزیی. ئەو شەوەش لەوێ ماینەوە.

لە دوای نوێژی بەیانی. ئاغای هەرکییەکانی گاز کردو داوای مەڕو ماڵاتەکەی کرد. ئەمجاریان هەرکییەکان‌و سەرۆکەکانیان، لەسەر ڕاوێژکردنی پێشووتریان. هەموو پێکەوە لە بڕیار و بەڵێنی خۆیان ژێوان بوونەوەو بە ئاشکرا ئەو زاتەیان جواب کرد. ئەو زاتەش، بەرق و تووڕانێکی زۆرەوە سوێندی خوارد، کە هەموو مەڕوماڵاتەکەم دەوێنەوەو لەبری ئەو مەڕوماڵاتەی براوەو خوراوەو مرداز بۆتەوە، ماڵاتی زیندووم دەوێنەوە. گورجیش فەرمووی: ئەسپەکەم بۆ بێنن‌و ئامادەبن بۆ ڕۆیشتن.



ئەو زاتە دەستنوێژی تازە کردەوەو خەریکی نوێژی نیوەڕۆ بوو. یاران‌و دەست‌و پێوەندیش بە دەوری ئەو زاتەدا کۆ ببوونەوە و سوارە و پیادە وەستابوون. ئەسپەکەی ئەو زاتەشیان ڕاگرتبوو، تا ئەو زاتە لە نوێژەکەی ببێتەوە و سوار بێت. هەر کام لە جەماوەر بە سواری وەستابوون.

لەو ناوەدا تەنیا من دڵتەنگ مابوومەوە. لە دڵی خۆمدا وتم: من چۆن بە پێ بڕۆم! لە ناکاو، یەکێک لە هەرکییەکان وڵاخێکی لەناو ڕەوەکە گرت‌و بە کاوەخۆ بۆی دەهێنام، تا سواری ببم. هەوساری ئەسپەکەشی توند لە دەستییەوە پێچابوو. خەریک بوو دەگەیشتە لام، بە ڕێکەوت وڵاخەکە ڕەمی کرد، هەڵگەڕایەوەو بەرەو ڕەوەی ئەسپەکان تێی تەقاندو پیاوە هەرکییەکەیشی بە زەویدا کوتاو بە دوای خۆیدا ڕایکێشا.

هاوار و ژاوەژاو و شیوەن و ڕۆڕۆ، لە ژن و پیاو و پیر لاو بەرز بۆوە هەرچی هەرایان لە کابرا کرد، کە هەوسارەکەی بەردە، بێهودە بوو. لە سەرەتادا جووتەیەکی وای لە سەری سرەواند، کە سەر و مل و مێشکی بەیەک جار پژاندو کردیە تۆزی دەم با. بەرەو دۆڵێکی قووڵ و سەرەو خوار، بەسەر خڕکە بەرددا تێی قوچاند. هەتا ناو ڕەوەی گەلە ئەسپەکانیش نزیکەی چارەکە سەعاتێک ڕێ بوو. هەتا ئەوێ تلاوتل، بە ڕاکێشان و بە جووتە وەشاندن، ئەو پیاوەی فڕاند.

لەبەر گریان‌و هاواری ژن‌و پیاو و شیوەن‌و ڕۆڕۆی هەرکییان؛ دەتکوت ڕۆژی قیامەتە. ئەو زاتە لە نوێژو تەسبیحات بۆوەو بە گورجی دوو کەسی بە تەلیسێکەوە نارد، تا بە شوێن وڵاخەکەدا بڕۆن، هەتا ناو ڕەوەکەو لەت‌و کوتەکانی ئەو پیاوە، کۆ بکەنەوەو بیهێنن.

پیاوەکان بە پێی فەرمانی ئەو زاتە، هەتا لەودەرکەکە چوون‌و لەت‌و کوتەکانیان هەر پارچەیەی لە شوێنێک‌و لە بن بەردێکدا دۆزییەوەو کۆیان کردنەوەو لەگەڵ ئەو دەست‌و شانەدا کە بە هەوساری وڵاخەکەوە مابووەوە، لە تەلیسەکەیان کرد و هێنایان.

ئەو زاتە بە جەنابی خەلیفە مەلا عەبدولئەحەدی زاوای فەرموو: تۆ بمێنەوەو ئەم لەت‌و کوتانە، لەم نزیکانە بنێژە. ئەویش فەرمووی: دوعاو تەلقین نازانم. بە منی فەرموو: تۆش بمێنەوەو تەلقینی بخوێنە. عەرزم کرد: ئەمڕۆ لێرە قیامەتێک ساز بووە، زۆر جێگەی ترس و مەترسییە، ئێوە بۆ خۆتان بڕۆن، ئەم دوو کەسەمان لە ناو ئەم گورگە دڕو برسییانەدا بەجێ بهێڵن، من زۆر دەترسم.

ئەو زاتە سواری ئەسپەکەی بوو. فەرمووی: دەقی تەلقینەکە بنووسەو بیدە بە خەلیفە. خۆت لەگەڵ مندا وەرە. منیش دەقی تەلقینەکەم نووسی‌و دامە خەلیفەو هەتا تەواو بوو، ئەو زاتە بە سەر ئەسپەکەیەوە وەستا. بە پێ لە پێش ئەو زاتەوە، کەوتمە ڕێ‌و ئەوانی تریش لە دواوە و لە پێشەوە دەهاتن. ئەو زاتەش خێرالیی دەخوڕی. منیش وەک شاتر کەوتمە لۆقەو ڕاکردن. دوای ئەوەی کەمێک دوور کەوتینەوە، لە دڵی خۆمدا وتم: وا چاکە خێراتر بڕۆین. نەوەکو ئەم گورگانە کۆ ببنەوەو بە دوامانداا بێن. یوسفی پیر و لاومان ئازار بدەن. ئەمە چ قیامەتێک بوو. سەری هەڵدا. ئەمە چ ڕووداوێک بوو، قەوما؟!

لەم کاتەدا ئەو زاتە، فەرمووی: میرزا، هیچ مەترسە. هیچ نابێ. ئەم کارەساتەش دەبوایە بقەومێ. تۆ نازانیت، سبەی هەموو مەڕومالاتەکە، دەهێننەوە؟! دوابەدوای ئەم فەرمودەیەی ئەو زاتە، ئاسوودەو هێور بوومەوەو دڵەڕاوکەم نەما. ئەم هەموو جەماوەرودەست و پێوەندە، بەوپەڕی خێرایی‌و هەڵاتنەوە دەڕۆیشتن. پاش نوێژی خەوتنان، گەیشتینەوە نەهری. ئەو زاتەش تەشریفی بردە حەرەم‌و ئێمەش هەر کەسەمان بەرەو ماڵ‌و حاڵی خۆمان بووینەوەو لێی خەوتین.

بۆ نوێژی بەیانی، لە خەو هەستام و سەیری دەری ئاوایی‌م کرد. سەیرم کرد هەرکییەکان مەڕو مالاتەکەیان بێ کەم و زۆر، هێناوەتەوەو لە بناری کێوەکەدا دەیان لەوەڕێنن. خۆشیان لەگەڵ چەند ئاغاو سەرۆکیاندا، لەبەر دەرکەی خانەقا وەستاون‌و بە هەزار سووکی و شەرمەزارییەوە، پەژارەی هاتنی ئەو زاتەن، کە لە کارە گلاو و بەڵێنە پیسەکانیان چاوپۆشیی بکات‌و بە هەرزەیی خۆیان بیان بووریت.

ئەو زاتە تەشریفی هێناو لە دوای بەجێهێنانی نوێژی بەیانی، یەکە یەکەی هەرکییەکان، داوێنی لێبوردن و چاوپۆشیی ئەو زاتەیان ماچ کرد کەوتنە بەر پێڵاوی موبارەکی ئەو زاتەو لە کردەوەکانیان ژیوان بوونەوەو بەڵێنیان دا، کە ئیتر لەوە بە دواوە هەرگیز بێئەدەبیی وا نەکەن و بە پێچەوانەی فەرمانی ئەو زاتەوە نەجوڵێنەوە.

هەموویان کەوتنە بەر چاوپۆشی‌و لێبوردن‌و مۆڵەتی گەڕانەوەیان بۆ دەڤەری خۆیان خواست. بە پێی فەرمانی ئەو زاتە، هەموو مەڕ و مالاتەکە، بە خاوەنەکانیان درانەوەو ئەم کارەساتە، بووە هۆی دەرس وەرگرتنی خەڵکی ترو بووە هۆی نزیکایەتیکردنی نکوولیکاران. چوارینەی ١٨٦:

خوایە گیان بیلە بە خاتری ئابڕووی گەورەو شای مەردان
وەفایی بەندەی خۆتە. مەیخەرە ڕیزی دڵسارادان
ڕوو زەرد، تاوانبار. لاپەڕەی سپیم ڕەش لە دۆتەوە
بەناوێنەوە و بە تیغی عەشق بیلە بە قوربان

ئەو ساڵەش کە بە ماڵەوە هاتمە نەهری، خێزانم لە زمانی جەنابی پاک و مەزن، دایکی موریدان، واتە: خێزانی بەڕێزی ئەو زاتەوە گێڕایەوە: شەوێکیان ئەو زاتە بۆ شەونوێژ هەستایەوەو دەستنوێژی تازە کردەوەو هاتە سەر بەرماڵ‌و خەریکی شەونوێژ بوو. منیش لە بەرکی شەودا، لێفەکەم بەسەر خۆمدا ڕاکێشاو خەوتم. دوای تاوێک خەبەرم بووەوەو بە ئەسپایی سووچێکی لێفەکەم لەسەر سەرم لاداو لە جوانیی بێهاوتای ئەو زاتەم دەنواڕی. لە پشت ئەو زاتەوە دوو جنۆکەی کورتەباڵای سەر زلم بینی، وەستابوون و پاشنوێژیی دەکەن. واقم وڕما! کاتێ ئەو زاتە بۆ سوجدە داهاتەوە، بە دەستی پیرۆزی سووچی لێفەکەی دادایەوە، تا بیانی نەمبینێ. دوای تاوێکی تر دیسانەوە بە ئەسپایی لە ژێر لێفەکەوە نواڕیم. دیسان ئەو دوو جنۆکەیەم بینیەوە، هەروا لەگەڵ ئەو زاتەدا هەڵدەستن و دادەنیشنەوە.

دیسانەوە ئەو زاتە لە کاتی سوجدەدا، سووچی لیفەکەی بە ڕق و بێزارییەوە بە سەر ڕوومدا کێشا. بە ڕقێکی واوە، بە دەستی موبارەکی لیفەکەی بە سەرو چاومدا کێشا و ڕایتەکاند، کە دەم و چاوم ئازاری پێگەیشت.
دوای سلاودانەوە فەرمووی: بە ئەدەب بە، هۆشت بە چاوتەوە بێت...
منیش لە ترسی ڕەنجانی ئەو زاتە، ئەمجار چاوم لێک ناو سەیرم نەکرد.
دوای تەواوبوون عەرزم کرد: لە دەورت گەڕێم، ئەگەر لوتفم لەگەڵ نەکەیت و پێم نەڵێی ئەو دوو جنۆکەیە چی بوون، دیق دەکەم. فەرمووی ئەم دوو جنۆکەیە موریدی باوکم بوون، دوای مەرگی باوکم، نکوڵییان کرد و هەڵاتن. ئەوا ئێستا تۆبەیان کردووەو ژیوان بوونەتەوەو گەڕاونەتەوە. چوارینەی ١٨٧:

وەفایی، ئەگەر ماوەیەک خۆتت لە بیر نەمێنێ
گیانت لە ڕێگەی خواپەرستیدا، خۆی بکوژێنێ
ئەگەیتە هەرمان، ئەوسا فریشتەو دێو و ئینسانیش
هەمووی ئیرەیی بە نزیکی تۆ و خوای گەورە دێنێ

دیسان ساڵێکیان خەلیفە ڕەحمەتوڵڵا، بە پێی فەرمان لە خانەقادا، خەریکی خۆ پاککردنەوە و خۆ ڕوون کردنەوە بوو. ئەو جەنابە هێشتا سەرەتای تەریقەتی بوو.
هێشتا مۆڵەتی پێ نەدرابوو کاتێ نان و خوانیان بۆ من دەهێنایە خانەقا، ئەگەر (دۆ)ی لەگەڵ بووایە، جەنابی سەید دەهات و بە هەزار تکا و پاڕانەوە، داوای دوو سێ کەوچک دۆی دەکرد و دەیخواردەوە. هەرچی بەرگریم دەکرد، بەگوێیدا نەدەچوو، بە دزییەوە دەیخواردەوە، هەتا چلەکەی دەکێشاو لە سلووک دەهاتە دەرێ. ئەو زاتە زۆر گوێی نەدایە. ئەویش دەستی ئەو زاتەی ماچ دەکردو بۆ وڵاتەکەی خۆی، بۆ سەقز دەگەڕایەوە. ساڵی دواییش جەنابی سەید هاتەوەو بە سلوکەوە خەریک بوو. دیسانەوە داوای دۆی دەکردەوە. ئامۆژگاریی بێ کەڵک بوو. دیسان چلەکێشانەکەی دوایی هات و وەک ساڵی پێشوو بۆ وڵاتەکەی خۆی گەڕایەوە. ساڵی سێیەم سەرلەنوێ هاتەوە ئەهری. ئەو زاتەش بۆ گۆڕینی ئاووهەوا ڕووی کردە مەیدانان. ئەویش لەگەڵ مەزنە پیاواندا، لە خزمەت ئەو زاتەدا چوو بۆ مەیدانان. بەپێی فەرمان چادرێکی تایبەتییان دوور لە خەڵکەکە بۆ ئەو هەڵدا.
دیسانەوە جەنابی سەید خەریکی سلووک بووەوە. ئەمجارەیان چونکە شوێنەکەی من لە چادرەکەی ئەوەوە دوور بوو، هەر چەند جارجار تکای دۆی دەکرد. ئەمدەهێشت پێی بگات. ئیتر بە یەکجاریی هاموشۆی ئەوم دابڕی. تا ئەو کاتەی چەند ڕۆژێکی مابوو چلەکەی دوایی بێت... ئەو زاتە، بە منی فەرموو: ئیجازەنامە بۆ جەنابی سەید بنووسە. واتە ئەگەر ئەمساڵیش دۆی بخواردایەتەوە، بە دەستی بەتاڵ دەڕۆیشتەوە. منیش ئیجازەنامەکەم بۆ نووسیو چوومە ڕەشماڵەکەی




ئەو جەنابەو ئیجازە نامەکەم دایەو پێم وت: ئەو زاتە دەیفەرموو لە چادرەکەت وەرە دەرێو سلوک دوایی هات، دەتوانیت بۆ وڵاتی خۆت بگەڕێیتەوە. سەرقاڵی ڕێنوێنی موسوڵمانان بە. چوارینەی (١٨٨).

وەفایی: تاکەی دیدەنی و سەیری ڕووی ئەم جیهانە
ڕووزەرد دەبیت و بێ دڵ دەمێنی، وا بێ خەمانە
خۆت بدەرە دەست خواجەیەک، ئەوسا دەبینی بە خوا
ئەگەر سارد یش بیت، دەبیتە مەردو دەبیتە تاقانە.

# ئاوێنەی شکاو

## لێکۆڵینەوەیەک لەبابەت شیعری وەفایی

ناسری حسامی

**دیوانی وەفایی، لێکۆڵینەوەی محەممەد عەلی قەرەداغی**
**چاپی دووهەم، بەغدا، ١٩٨٤.**
**٣٣٦ لاپەرە**

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

دیوانی وەفایی

« میرزا عەبدوڕڕەحیمی سابڵاخی »

لێکۆڵینەوەی

محەممەد عەلی قەرەداغی

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد
[illegible] – ١٩٧٨

بەشێکی زۆر لە شیعرەکانی ئەم دیوانە ئاڵۆزییەکی بەرچاویان پێوە دیارە، بە جۆرێک کە خوێنەر هەرچەندی لێیان ورد دەبێتەوە ناتوانێ تێیان بگا، یان هەست بەوە دەکا هەڵەیان تێدایە. من هەوڵم دا شیعرەکان بەشێوەیەکی دیکە بخوێنمەوە.

**بۆ نموونە:**

١-جێ گۆڕکێم بە نیشانەی (،) (؟) (.)و ... کرد.

٢-ئەو پیتانەی کە شکڵ و شێوەیان لەیەکتر دەچێ (د، ژ، ر، ز/ ڵ، ج، گ، ڤ/ ف، ق، ب، پ، ت، پ، و...)و لەوانەیە بەهۆی کۆن بوونی دەسخەتەکە، نووسەر بەهەڵەی خوێندبێتەوە، جێ گۆڕکێم پێکردن.

٣-نووسەری دەسخەتەکان لە هەندێک جێگا دانانی خاڵ یان نووسینی پیتێک یان وشەیەکیان لەبیر چووەو نووسەر (قەرەداغی) نەیتوانیوە ساغیان بکاتەوەو تووشی هەڵەیەکی گەورەتر بووە. هەوڵم دا ئەوانە راست بکەمەوە.

٤-لە رێنووسی کۆندا زۆر وشە بە جۆرێک دەنووسرێن کە چەند جۆر خوێندنەوە هەڵ دەگرن کە مانای جیاوازیان هەیەو نووسەر بەهەڵەی خوێندوونەتەوە. من ئەوانەم بەشێوەیەکی دیکە خوێندەوە.

ئەنجامی کارەکە لەزۆر جێگادا بوو بەوە کە شیعرەکان مانای راستەقینەی خۆیان دەدۆزنەوەو دەچنەوە سەر جێگای خۆیان.

بۆ نموونە:

**ئەمن کەوتووم لەبەر گریان، دەڵێ دەستی من و دامان**
**سەباگەر بوویە خوێن دامانی یار، مەگری لەباتی من**

کە من هەرچەندی بیرم لەماناکەی کردەوە چم وەدەست نەکەوت، هەتا ئاوام خوێندەوە:

**ئەمن کەوتووم لەبەر گریان، دڵە! دەستی من و دامان!**
**سبەی گەر بوویە خوین، دامانی یار بگری لەباتی من**

کاتێک لە چەند نموونەیەک دا سوود بەخش بوونی ئەم شێوە خوێندنەوەیەم بۆ دەرکەوت، سەر لەبەری دیوانەکەم بەو چاوە خوێندەوە و لە زۆر جێگا کار ساز بوو، ئەگەرچی لە هەندێک جێگاش بە ئەنجامی دڵخواز نەگەیشتم. هێشتا زۆر شیعری ئاڵۆز لە دیوانەکەدا هەن مەسخ کراوی شیعری وەفایین.

بۆچی وای لێهاتوە؟

ئەم هەموو هەڵەیە بۆچی کەوتوەتە ناو شیعری وەفایی. محەممەد عەلی قەرەداغی (لە مەودوا لە هەموو جێیەک بەکورتی قەرەداغی) کەڵکی لە چەند سەرچاوە وەرگرتوە کە ئەمانەن:

-نوسخە دەسخەتەکان

-دیوانی وەفایی چاپی گیوی موکریانی- هەولێر

-دیوانی وەفایی چاپی محمد امین سیدیان- مهاباد

١-دەسخەتەکان هیچکامیان هی وەفایی خۆی نین و هەر بۆیە جێگەی متمانەی تەواو نین و لە هەموو نوسخە لەبەر هەڵگرتنەوەیەک دا ئیمکانی بەهەڵە نووسین و وشەکەوتن هەیە.

بێجگە لەوەش نوسخەکان بەرێنووسی کۆن نووسراون کە خوێندنەوەی جۆراوجۆر هەڵدەگرێ. قەرەداغی لەم بابەتەوە دەڵێ: "بۆ نموونە ئەگەر لە شوێنێکدا بنووسرێ (کل) هەڵ ئەگرێ گوڵ، گڵ، گەل، کل، کول، کەڵ، کوڵ، کڵی، ئەوەندە بارەی لێ بدۆزرێتەوە." (دیوان لاپەڕەی شازدە). ئەوەش لە کاتێکدا کە قەرەداغی خۆی دەڵێ "خۆم فارسی باش نازانم و شارەزاییەکی ئەوتۆم لە ئەدەبی فارسیدا نیە" و هەروەها شارەزای شێوەدوانی موکوریانی وەفاییش نیە، لە زۆر جێگا تووشی هەڵەی کردوە. سەرباری ئەوەش دەسخەتی سەرەکی -وەک نووسەر دەڵێ- جێجێ لەبەر تەڕبوون و دڵۆپە لێدراوی شلوێ بووەو باش ناخوێندرێتەوە.

٢-چاپی گیوی موکوریانی: گیو وەک خۆی گویا لەلای مامۆستا هێمنی شاعیر باسی کردوە، نوسخەی نووسراوی لەبەر دەست نەبووەو شیعرەکانی لە زمان کەسێک بیستوە.(١) بێجگە لەوەش گیو قسەی ئەوەی لەسەر بووە گۆیا خۆی شیعرەکانی دەسکاری کردوە.(٢)

٣-چاپی سیدیان: کە دیسان وەک قەرەداغی باس دەکا، لە زۆر جێگا کە شیعرەکانی وەفایی بۆ ساغ نەکراوەتەوە، سیدیان خۆی بۆشاییەکانی پڕکردوەتەوەو کارەکەی جێگای متمانە نیە.

لە کاتی خوێندنەوەی بابەتەکەدا، ئەم نیشانانە دەبینی:

شیعرەکە بەو جۆرەی لە دیوانەکەدا چاپ کراوە.

شیعرەکە بەو جۆرەی من دەیخوێنمەوە.

ـــــ ئەو وشەیە یان ئەو دەستەواژەیە کە لەلای راستی ئەم نیشانەیە نووسراوە لە روانگەی منەوە هەڵەیە. پێشنیارەکانی من لەلای چەپی ئەو نیشانەیە نووسراون.

لە وتارەکەدا، لەو جێیانە کە بە پێویست زانرابێ، شیعری شاعیرانی دیکەش بە نموونە هێنراونەتەوەو ناوی شاعیرەکە دەست نیشان کراوە. هەر نموونەیەک ناوی شاعیری لەلا نەنووسرابێ، شیعری وەفاییە.

خاڵی دەمتە یا مەگەسی حوققەیی شەککەر
یا خۆ حەبەشی زادە لە نێو ئاوی بەقادا؟

لەنێو ـــــ لەلێو

خاڵی دەمتە یا مەگەسی حوققەیی شەککەر
یا خۆ حەبەشی زادە لە لێو ئابی بەقادا؟

خاڵ لە گۆشەی لێوە نەک لە نێو لێو، هەر بۆیە حەبەشی زادە (کە تەعبیرێکە بۆ خاڵ) دەکەوێتە لێواری ئابی بەقا (کە تەعبیرێکە بۆ لێو).

بڕوانە:

**هەمدەمی من خاڵی گۆشەی لێوی تەعلیمی دەدام**
**عەیش و نۆشی کونجی تەنهایی بەڕووی دونیامەدە**
**فغان و گریە دل از غم روی تو در زلفت**
**دەڵێی بۆ گوڵ دەناڵێ شەو لە نێو بولبول لە سەحرادا**

(لەنێو بولبول لە سەحرادا) مانا نا بەخشێ. پێم وایە ئاوایە:

**دەڵێی بۆ گوڵ دەناڵێ نیوە شەو بولبول لە سەحرادا**

گومانم لە راست بوونی پێشنیارەکەی خۆم هەیە، بەڵام (لەنێو بولبول لە سەحرادا) بێگومان هەڵەیە.

**درۆت فەرمووی حەزم پێ نایەڵم، گەر ڕاست دەڵێی سادەی**
**فەرەنگی قەومی دەججال -ئەی مەسیحا- دەوری کەعبەی دا**

درۆت - برۆت

دەڵێی - دەڵێ

**برۆت فەرمووی "حەزم پێ نایەڵم"، گەر ڕاست دەڵێ سا دەی**
**فەرەنگی قەومی دەججال -ئەی مەسیحا- دەوری کەعبەی دا**

نووسەر لە پەراوێز دا نووسیویەتی: "فەرمووی: فەرموو راسترە".

